

# هەناسەکانی دڵ

نووسینی: محمد فەتحوڵلا گولەن
وەرگێڕانی: دەستەی وەرگێڕانی دەزگای چاپ و پەخشی کانی عیرفان
چاپی یەکەم: حوزەیران - ٢٠١٥
لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (٣٦٣)ی ساڵی (٢٠١٥)ی پێدراوە
تیراژ: ٥٠٠٠

شوێنی چاپ
Neşe
Neşe Matbaacılık - İstanbul - TURKEY
+90 212 886 83 30
www.nesematbaacilik.com



دەزگای چاپ و پەخشی کانی عیرفان
www.irfanpublishing.com

گوندی ئینگلیزی خانووی ژمارە ٩ / هەولێر
+964 (0) 750 713 80 00

# پێڕستی بابەتەکان

# پێشەکی

خوێنەری هێژا!

ئەم کتێبەی بەردەستت چەند وتارێکی هەڵبژێرراوی زانای موسڵمان "محمد فەتحوڵڵا گولەن"ی لەخۆ گرتووە. کاتی نووسرانی ئەم وتارانە دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای دەرچوونی گۆڤاری (سزنتی) لە ساڵی ١٩٧٩ دا و ساڵانی دواتر، کە لە شێوەی سەروتاردا لەم گۆڤارەدا بڵاوبوونەتەوە. نووسەر تا ئەمڕۆش بەردەوامە لە نووسین لە گۆڤاری ناوبراودا. هەرچەندە ئەم وتارانە لە چەند کاتێکی جیا و شوێنی جیا و بارودۆخی جیادا نووسراون، بەڵام لەنێو خۆیاندا خاوەنی یەکێتی و تەواوکارین و، جیهانبینی و بۆچوونی نووسەرەکەیان دەردەخەن لەمەڕ چەندین بابەتی جۆراوجۆری مرۆیی و، جیهانی و، ئایینی و، مێتافیزیکی.

ئەم وتارانە زادەی خەمێکی قووڵ و، عەشقێکی فراوان و، دڵێکی بەسۆزن کە هەریەکەیان پاش ژان و ئازارێکی زۆر لەدایك بوون و، لە سەردەمانێکی تایبەتدا بیری نووسەر و کۆمەڵگای نووسەریان بە خۆیانەوە خەریك کردووە. هەر بۆیە چەند نووسینێکی گەرم و گوڕ و، تەڕ و پاراون و، لە هەناو و ویژدانی زانایەکی خەمخۆر و بەئەزموونەوە هاتوونەتە دەر و، ئامانجیان دۆزینەوەی چارەسەرێکە بۆ هەموو ئەو کێشە و تەنگژانەی کە وڵاتی تورکیا و دنیای ئیسلامی بەتایبەتی و جیهان بە گشتی پێیانەوە گیرۆدەن. کەواتە بەلاتەوە سەیر نەبێت ئەگەر لە هەموو دێڕ و، پەرەگراف

و، لاپەڕەیەکیدا دڵێکی بەجۆش و، ڕۆحێکی پڕ لە جوانی و، گیانێکی نویٚ و زیندوو تیایدا نمایان بێت.

محمد فەتحوڵڵا گولەن موسڵمانێکی جیهانییە. هەروەك کوڕی کۆمەڵگەی ڕۆژهەڵات و ئیسلامە و، لە باوەشیدا گەورە بووە و، بە جوانییەکانی گۆش بووە و، بە خەم و ئازارەکانی دڵی گوشراوە، بەهەمان شێوە خاوەنی زمانێکی جیهانییە و لە نزیکەوە ئاگاداری دواین ڕووداو و پێشهاتەکانی دنیایە و، گاە ڕەخنە لە لایەنە خراپەکانی شارستانێتیی نویٚ دەگرێت و، گاە ڕەچەتە و چارەسەر و دەرمان پێشکەش بە زامە ماددی و مەعنەوییەکانی مرۆڤی نویٚ دەکات. شایانی ئاماژەیە گولەن هەڵگری هەمان جیهانبینیی زانای گەورەی کورد (سەعیدی نوورسی)یە و، درێژەپێدەر و هێنەرەدی وەسێتی "کاری ئیجابی" ئەوە و، زمانێکی جیهانییە بۆ گەیاندنی پەیام و خەمەکانی ئەو. لەم ڕووەوە هیواداریین خوێنەرانی کوردزمانیش لێی بێبەش نەبن و، ئەگەر لە دەلاقەیەکی بچووکیشەوە بێت، ئاشنا ببن بە کەسایەتی هەمەڕەنگی ئەم زانایە.

محمد فەتحوڵڵا گولەن لە ساڵی ٢٠١٣ دا لە لایەن گۆڤاری "تایم"ەوە بە کاریگەرترین کەسایەتی ساڵ هەڵبژێرراوە و لە جیهاندا بە پشتیوانی کردن لە ئازادی و، مافی مرۆڤ و، بەها مرۆییەکان و، دیموکراسی و، ئاشتی و، لێبوردەیی و یەکتر قبووڵ کردن و، دیالۆگی نێوان ئایین و شارستانێتییە جیاوازەکان دەناسرێت. هەروەك بە هەڵوێستە توندەکانی بەرامبەر بە هەموو جۆرەکانی تیرۆر دەناسرێتەوە و ڕاستەوخۆ لە دوای ڕووداوەکانی ١١ی سێپتەمبەر، وتارێکی بەناوبانگی لە ڕۆژنامەی "نیویۆرك تایمز"ی ئەمریکیدا بڵاوکردەوە و تیایدا جەختی لەسەر ئەوە کردەوە کە نە موسڵمانی

ڕاستەقینە دەکرێت تیرۆریست بێت، نە تیرۆریستیش دەکرێت موسڵمانی ڕاستەقینە بێت. لە ناوخۆی تورکیا و دەرەوەیدا چەندین کتێب و لێکۆڵینەوە و نامەی ماستەر و دکتۆرا لەسەر بیر و بۆچوون و بەرهەمەکانی نووسراون. لە ژیانی شەخسی و ڕۆژانەشیدا سادەیی و، خاکی بوون و، خۆبەکەمزانین گرنگترین سیفەتیەتی. ئەمڕۆ ئەو خۆشەویست و لایەنگرانەی نووسەر کە ئیلهامیان لە ژیان و بۆچوون و جیهانبینی ئەو وەرگرتووە، بە هەر چوار لای دنیادا ، هەر لە ناوجەرگەی ئاسیاوە هەتا ئەمریکای لاتین و، هەر لە سیبیریاوە هەتا وڵاتە هەرە چەپەك و دوورە دەستەکانی ئەفریقا، هەر لە ئەوروپاوە هەتا ئاسیای ڕۆژهەڵات، بڵاوبوونەتەوە و پەیامی ئاشتی و، پێکەوەژیان و، فرەکلتوری و، بەها مرۆییەکان دەگەیەنن و، لە ڕێگەی کردنەوەی قوتابخانە و، ڕێکخراوی خێرخوازی و، سەنتەری دیالۆگەوە ڕوویەکی جوانی ئیسلام و موسڵمانان پیشان دەدەن.

خوێنەری ئازیز!

ئەم کتێبە پێکهاتووە لە چەند وتارێك کە لە نۆ کتێبی جیاوازەوە هەڵبژێرراون. ناوی کتێبەکانیش بەم شێوەیەن: چاخ و نەوە، مرۆڤ لە ناوەندی گەرداوی قەیرانەکاندا، بەرەو بەهەشتی لەدەستدراو، پارچە ئاڵتوونییەکانی کات، ڕۆژانی بەهار، فیکرە سەوزبووەکان، ئاسۆی ڕووناك، بزووتنەوەیەك کە مۆدێل و نموونەکانی لەناو خۆیدایە، هاوارەکانی بێدەنگی. وەکو لە ناونیشانی کتێبەکانەوە دەردەکەوێت، لەڕاستیدا ئەم زنجیرە کتێبە هەموویان یەك کتێبی دوور و درێژن و تیایدا هەنگاو بە هەنگاو جیهانی فیکریی نووسەر دەناسێنن. سەبارەت بەم کتێبەی بەردەستیشت، نووسەر سەرەتا لە "هەموو بوون ئاوێنەیەکە" و "ڕوانگەیەك"دا بوونەوەران توێ توێ دەکات

و لە هەموو پارچەیەکیدا نیشانەکانی بەدیهێنەر هەڵدەگۆزێت. لە "وەفا" و "بەزەیی" و "بەختەوەری" و "خۆشەویستی" و "دایك" دا تیشك دەخاتە سەر چەند بابەتێکی هاوبەشی مرۆڤەکان و بانگمان دەکات بۆ سەرلەنوێ بایەخ پێدانیان. لە "ئاژاوە و باوەڕ" و"سروشتی شێوێنراو" و "بتی زانست"دا پەنجە دەخاتە سەر چەند کێشەیەکی هەنووکەیی کۆمەڵگەی مرۆیی. پاشان لە "ڕابەر" و "وێنەی مرۆڤی فیداکار" و "کرێکارانی فیکر لە داهاتوودا" و "بەرەو دنیایەکی نوێ"دا وێنەی ئەو تاك و کۆمەڵگەیە دەکێشێت کە ساڵانێکە نووسەر و کۆمەڵگاکەی حەسرەتی بۆ دەکێشن و چاویان لە ڕێیەتی. ئنجا لە "پشت کردن لە زانست و زانیاری"دا بێمانایی دوورکەوتنەوە لە زانست نیشان دەدات و هانمان دەدات بۆ گرنگی دان بە پێشکەوتنی زانستی.

لە کۆتاییدا هیواداریین ئەم کتێبە سوودی بۆ خوێنەرانی کوردزمان هەبێت و، لەم کلاوڕۆژنەیەوە ئاشنایان بکات بە دنیایەکی نوێ و، ببێت بە مایەی دەوڵەمەندکردنی پاشخانی فیکری و ڕۆحییان و، توێشوویەك بێت بۆ ئێمەش لە ڕێگای دوور و درێژی ئەبەدییەتدا. سەبارەت بە وەرگێڕانی ئەم کتێبەش جێی خۆیەتی دان بەوەدا بنێین کە کارەکەمان ئاسان نەبووە و، هەوڵێکی زۆرمان داوە بۆ گواستنەوەی ئەو خۆشەویستی و، جۆش و خرۆش و، شیعرییەت و، ژان و، جوانییەی کە لە هەموو یەکێکی دێڕەکانییەوە دەچۆڕێت. بەڵام هیچ کارێك بێ هەڵە و کەموکورتی نییە و هیواداریین لە داهاتوودا کەسانێکی شیاو دەربپەڕنە مەیدان و مافی تەواوی خۆی پێ بدەن. تۆش -ئەی خوێنەری هێژا!- بانگێشت دەکەین بۆ خوێندنەوەیەکی لەسەرخۆ و وردی ئەم کتێبە...

# هەموو بوون ئاوێنەیەکە

لەم جیهانەدا هەموو شتێك ئاوێنەیەکە "ئەو" نیشان دەدات و، زمانێکی گۆیایە باسی "ئەو" دەکات و نەغمەیەکە "ئەو" دەدرکێنێت. مرۆڤ و بوونەوەران و هەموو جیهان بە دەنگ و بێدەنگییان، بە وەستان و جووڵەیان، بە بوون و بە بەرهەمەکانیان، هەمیشە شایەتیی لەسەر ئەو دەدەن. بە ئەندام و فەرمانەکانیان ئەو دەڵێنەوە، بە مانا و ناوەرۆکیان ئاماژە بە ئەو دەکەن، بە شکڵ و شێوە و ڕەنگیشیان وەك سێبەرێکن لەچاو ڕووناکی بوونی ئەودا... با ئەوانەی نایبینن نەیبینن، بەڵام ئەوانەی کە چاویان لەگەڵ بەسیرەتیاندا یەکیگرتووە و مافی نیعمەتی بینین دەدەن، ئای چ شتانێك سەبارەت بەو لە هەموو شتێکدا دەبینن و، چ دەنگ و چ وشەیەك دەبیستن لە درەوشانەوە جیاوازەکانی ئەوەوە.. ئەگەر دڵەکان کراوەبن بەڕووی ئەودا و چاوەکانیش بێ پەردە بن -ئەمە لەوانەیە بۆ هەموو کەسێك بە هەمان ئاست مەیسەر نەبێت- هەر کاتێك لە کتێبی بوونەوەران بڕوانین و بەوردی بکەوینە خوێندنەوەی،

هەر کاتێك بە پێشانگای گۆی زەویدا بگەڕێین و تەماشای بکەین، هەموو شتێکی ناوی زیاتر کەمەندکێش و پتر مەستمان دەکات. ئەوانەی کە بە ناوی بەدیهێنەرەوە بۆ بوونەوەران و ڕووداوەکان ناڕوانن، یاخود ناتوانن بڕوانن، ئەم سیحر و ئەم مانا و ئەم ناوەرۆکەی ناوی نابیستن.. ئەم جوانی و ڕێکوپێکی و نەرمی و ناسکییەی ناوی نابینن و، هەست بە ویست و ئیرادە و دانایی پشت هەموو بەدیهاتووان ناکەن.

ئەمە لە حاڵێکدا کە هەموو دەمێك بوونەوەران ئەفسونێکی سیحری بەسەریاندا هەڵدەکات و، وەك کێڵگەی گوڵان دەشنێتەوە سروشت، چەپکەکانی ڕووناکی دەبارێن، وەك ئەوەی بە میهرەبانییەوە بەسەرماندا بڕژێن.. شەماڵەکان هەموو ساتێك بە نەرمونیانییەکی جیاوازەوە دەست بە هەموو لایەکماندا دەهێنن. وە بە هەزار و یەك بۆنەوە هەڵدەکات با.

بەڵێ، لە چاوی ئەو کەسەدا کە دیدگای خۆی ڕێك خستووە، گشت گیاندار و بێگیانێك بە بەژن و باڵاکەی پەنجە بۆ ئەو درێژ دەکات و، کاتێك بۆ ئێمە پێدەکەنن ئاماژە بە ئەو دەکەن و، ماناکانی تایبەت بە ئەو لە شێوەی تابلۆی ڕەنگیندا دەردەخەن و، دیمەنگەلێکمان دەخەنە پێش چاو کە دڵ لە تەماشاکردنیان تێر ناخوات. ئای چ دەنگ و چ مۆسیقایەك دەدەن بە گوێماندا! لە چاوماندا سەرانسەری بوون لە حاڵەتی عەشق و بەیەکگەیشتندایە و، ئێمەش تاو تاو بەشداری ئەم ئاهەنگە دەکەین و، بە ئەندازەی فراوانیی ئاسۆمان تامی سەرمەستیی دەچێژین و، لە هەموو هەناسەدان و دانەوەیەکیدا یادی ئەو دەکەینەوە. چەند ڕوانینمان ڕوونتر بێت ئەوەندە جیاوازتر هەست بە دەنگ و ڕەنگەکانی چواردەورمان دەکەین

و، وەك ئەوەی لە زمانی هەموو شتێك تێبگەین، هەموو جووڵەیەك مانای جیاوازی لێ دەردەهێنین و گشت دەنگێك جیاوازتر لێك دەدەینەوە. هەر لەو گژوگیا و درەختانەی لە دەوروبەرماندا دەلەرێنەوە هەتا ئەو باڵندانەی بە سەرماندا تێدەپەڕن، هەر لەو زیندەوەرە وردیلانەی لەژێر پێماندا ژیانێکی ڕاکەڕاك بەسەر دەبەن هەتا ئەو بوونەوەرە مەزن و زەبەلاحانەی کە ترس دەخەنە نێو دڵەوە، هەر لە کێڵگەی بوونەوەرانەوە هەتا مرۆڤ کە وەك دەست و، قاچ و، چاو و، گوێ و، زمان و، لێوی درەختی بوونەوەران وایە. بەڵێ، لە هەموو شتێك و لە هەموو تەنێکەوە، نامەی پەڕلەدار و بێ پەڕلە وەردەگرین و، هەوڵ دەدەین بیخوێنینەوە و نهێنییەکەی ناوی بکەینەوە. چەند لە نهێنییەکانیش تێگەیشتین ئەوەندە زیاتر ڕۆدەچین و، بە دنیای ناوەوەماندا دەکرێینەوە و، ئەوەندەی تر شاباڵ دەگرین -خۆشبەختی بۆ ئەو کەسەی دەتوانێت ئەمانە بکات!- تا ئەوەی چڕدەبینەوە لە دیوی ناوەوەی هەموو شتێکدا.

ئیتر بۆ کەسێکی لەم جۆرە جیهان و بوونەوەرانی ناوی کتێبێکی مانادارە و، ئەم کۆشکە سیحرئامێزەی دنیاش دەبێت بە پێشانگایەك و، سەرگوزەشتەی ژیانیش دەگۆڕێت بە گەشتێکی بەچێژ بەرەو ئەبەدییەت. پاشان ئەو کەسە بەو شتانەدا کە دەیانخوێنێتەوە و دەیانبیستێت، هەست دەکات زیندووە و تا وای لێ دێت هەموو تەمەنی دەبێت بە مەلەیەك لە ئاسۆکانی دڵ و ڕۆحدا. هەتا بوون و ئەودیوی پەردەی بوون بکرێنەوە بەڕووی ویژداندا، ناسین و خۆشەویستی ناو ئەو کەسە دەگۆڕێت بە عەشق و تاسەیەکی قووڵ. ئیتر لە هەموو شتێکدا ئەو دەبیستێت و هەست بە ئەو دەکات و هەموو تەنێك پەیوەست دەکات بە ئەوەوە. ژیان لە چاوی

ئەودا زۆر جوانتر دەردەکەوێت، هەموو شتێك زمان و شێوەی دەگۆڕێت و پێناسێکی سیحرئامێزی بۆ پەیدا دەبێت. ڕۆحیش کە گشت تێبینییە ڕووکەشەکانی تێپەڕاندووە، ئای بێدار دەبێتەوە بەسەر چ ڕازگەلێکی مەحرەمدا کە تا ئەو کاتە بوخچەیان نەکراوەتەوە!

بەڵێ، ئەگەر سنووری لاشە و ماددە تێبپەڕێنین، سەرانسەری بوون بەشێوەیەك دەبینین وەك ئەوەی ڕەهەندی گۆڕیبێت، بە جۆرێك وا هەست دەکەین کە لە جیهانی خەونەکانداین، هەست دەکەین و هەموو ڕووداوێك جیاواز لێکدەدەینەوە. ئەو هەوایەی کە هەموو چرکەیەك هەڵیدەمژین، ئەو کانیاوانەی کە وشەی (هو) دەچڕن، ئەو گژوگیا و درەختانەی کە بە شنەی با دەلەرێنەوە و لە کاتی لەرینەوەشیاندا ناسکترین ئاواز لە شێوەی چەپکە مۆسیقادا پێشکەش دەکەن، ئەو ئەستێرانەی کە بە هەڵهاتن و ئاوابوونیان هەموو شەوێك گۆرانییەکی جیاواز دەڵێن، ئەو مانگ و خۆرەی کە بە ژمێرارییە ورد و ڕێکوپێکەکەیان هەموو ڕۆژ و هەموو شەوێك ئاهەنگ و شادییەکی جیاواز سازدەکەن.. جگە لەمانە ئیمانیش بە ئەندازەی ئەو فراوانییەی دەیبەخشێت بە دڵان، وامان لێ دەکات هەموو شتێك بە یەکێك لە ئێمە یان پارچەیەك لە بوونمان بزانین. لە هەموو تەماشا کردنێکی ئەم جیهانە مەزنەی کە لێوانلێوە لە جوانی، خۆمان دەدەینە دەست شەپۆلەکانی عەشق و شەوق و، وەك ئەوەی لە کاتێکی ئەفسووناویدا مەلە بکەین، هەمیشە و بەردەوام بەرەو ویساڵی خۆشەویستی خۆشەویستان ڕێ دەکەین. لە کاتی تێپەڕبوونیشدا ڕووناکی لەو نیشانانە وەردەگرین کە ئەو لەسەر ڕێگاکان دایناون و، شێتانە چاکوچۆنی لەگەڵ هەموو گیاندار و بێگیانێك دەکەین کە

دێته ڕێمان و، سڵاو لە ئاماژە و ئاماژەدەرەكان دەكەین و، هەوڵ دەدەین زەحمەتی ڕێبواریی بگۆڕین بە ڕەحمەتی ڕێ و، ئەو چركە و خولەك و سەعاتانەی كە بە سپاردە لەم گەشتەدا پێمان دراون، بە نییەت و تێبینییە خواییەكان هێندە قووڵی دەكەینەوە كە شایانی هەمیشەیی بێت و، تا وای لێ دێت ئەم ژیانە كورتە دەگۆڕین بە ڕێڕەوی جاویدانی.

لەڕاستیدا هەموو جوانییەكانی ئەم دنیایەی كە لە دڵاندا سەرسامی دروست دەكەن، بە نییەت و دیدی ئێمە و بە ویست و ڕوانینی خۆشویستراویش دەكرێتەوە و فراوانی بەدەست دەهێنێت و دەبێت بە ئەبەدیی. تا ڕۆژێك دێت درەوشانەوە ڕەنگاوڕەنگەكان لە ئاسۆی ڕۆحماندا بێ كوژانەوە و بە هەمیشەیی دەبریسكێنەوە. بەڵێ، ئێمە تام و چێژی میوەكانی ژیان بە لوتف و بەخششی خۆشەویستمان دەزانین. پەیوەندیمان بە بوونەوەرانی دەوروبەرمانەوە و ئەندازەی ئەو پێكەوەبوونە گەرموگوڕ و هاوڕێیەتییەمان لەم ڕێگا دوور و درێژەدا لەگەڵ بەدیهاتوواندا، بە ئەندازەی ئەو پەیوەندییە دەبێت كە بە خۆشەویستی تاقانەوە هەمانە. پاشان بە ئەندازەی پاراستنی گەرمیی ئەو پەیوەندی و خۆشەویستی و نزیكییەی كە لەگەڵ ئەودا هەمانە، پەیوەندیمان بە هەموو شتێك و هەموو كەسێكەوە بەردەوام دەبێت. چونكە هەموو عەشق و پەیوەندییەكان هیی ئەون، ئەویش تاقە فەرمانڕەوای تەختی خۆشەویستییە. هەموو شتێك بە بەژن و باڵای تایبەتی خۆی ئەو دەدركێنێت و خۆشەویستیی ئەو دەدات بە گوێماندا. ئێمەش بەدرێژایی ئەم ڕێگایە لەبەر خاتری ئەو بگەین بە هەر شت و هەر كەسێك خۆشماندەوێت. ئەگەر لەم ڕێیانەدا چاومان بكەینەوە، ئەوا بۆ ئەوەیە كە شتێك لەلای ئەوەوە ببینین و

ئەگەر گوێش هەڵبخەین بۆ بیستن، تەنها بۆ ئەوەیە کە شتێك لە ئەوەوە بشنەوین. لەڕاستیدا ئەمە مافی ئەوە و لە هەمان کاتدا قەرزی ئەستۆی ئێمەشە. بەڵێ، ئەگەر سەری وشەیەك بگاتەوە سەر ئەو، کەواتە نرخی خۆی دەست کەوتووە. ئەگەر بیرکردنەوە دەرگا بۆ ئەو بخاتە سەر پشت، نرخێکی دەبێت. ئەگەر هەر جووڵە و پلانێك بە ئامانجی گەیشتن بەو ئەنجام بدرێت، کەواتە لەسەر ڕێی ڕاستە.

ئێمە بۆ خۆ ئامادەکردن بۆ جیهانێکی تر نێرراوین بۆ ئەم دنیایە. بانگەواز بۆ ئاینیش بریتییە لە بانگکردنی مرۆڤەکان بۆ ئەو جیهانە. ئەوانەی کە باوەڕیان بەمە هەیە، دەزانن بۆ ئەوە نێرراونەتە ئەم خانەی خەم و ئازارەوە تا بە هەست و بیر و نییەت و گشت چالاکییەکانیان وەڵامی ئەم بانگە بدەنەوە و، ببن بە شایانی ئەو لوتف و بەخششانەی کە لە جیهانی نادیارەوە دێن و، دەشزانن کە پێویستە لەسەریان بەدەم ئەم بانگەوازەوە بڕۆن. لە چاویاندا نووری ئەو و لە دڵیاندا سیحری باوەڕهێنان پێی و، خولیاکانیشیان پڕە لە ئارەزووی بەتینی گەیشتن بە ئەو. بەم شێوەیە ئەوان بێ وەستان و پشوو بەرەو ئەو دەڕۆن. بە ئیمان و ئیسلام و ئیحسان گۆش دەبن و، بە مەعریفەتی ئەو هەڵدەشێلرێن و، بە عەشق و شەوقیش تا دێت نەرم و ناسك دەبنەوە.. هەمیشە بەختیار و هەردەم سەرسام و، بەدرێژایی ڕێگا گوێ لەو سروودانە دەگرن کە بە باڵای ئەودا هەڵدەدەن، بە هەرکەس و هەرشتێك بگەن پرسیاری ئەوی لێ دەکەن، دەڕۆن بەرەو ئەو مەوجودە مەجهولە، بەرەو سوڵتانی دیار و نادیار. چاویشیان تەنها لەسەر ئامانجەکەیانە.. ناڵێن ئەم ڕێگایە چەند درێژە و، کەی دەگەین بە مەنزڵ و، بەیەکگەیشتن کەیە. بەڵکو بە

ئومێدی لوتف و شەفەقەتی زیاتر، هەمیشە دەستووریان ڕاستگۆییە و هەڵسوکەوتیان لە بازنەی ئیخلاسدایە و بەو تاسەمەندییە زۆرەی کە هەیانە بۆ تەماشا کردن، حەز ناکەن تەواو ببێت ئەم گەشتی مەعریفەتە. تا لە ڕۆیشتن بەردەوام بن ڕوخساری درەخشانی بەختی باشیان و، دیوەکەی تری ژیانیان و، دنیای ڕازئامێزی ئیمان، زیاتر و باشتر دەبینن. دەبینن و لە هەموو شتێك پەیامی جیاواز وەردەگرن و، لە هەموو هەنگاوێکدا دەنگێکی نوێ و، لەگەڵ بیستنی مژدەیەکی تازەدا وەکو هەڵۆ لە شەقەی باڵ دەدەن و، وەك ئەوەی بەرزببنەوە بۆ میعراج هەردەم لە هەڵکشاندان و، دەگەن بە ڕەهەندانێك کە پێشتر نەیانزانیوە، بە جیهانگەلێکدا دەگەڕێن کە نایناسن، س لاو لە هەموو شتێك و هەموو کەسێك دەکەن، چەپکی زەردەخەنەیان بەسەردا دەبارێنن، پاشان بەردەوام دەبن بەرەو کۆتا سنووری سروشت. بەدەم بۆن کردنی گوڵ و گەڵاوە، بەدەم گفتوگۆ کردن لەگەڵ هەموو شت و هەموو کەسێکدا، بەدەم هەواڵ گۆڕینەوە و چاکوچۆنی لەگەڵ ڕووناکی و سێبەردا، لە هەر دەنگ و هەر وشە و هەر شکڵ و هەر شێوەیەکدا شتێك دەبیستن لە ئەوەوە...

ڕۆژێکیش دێت ئیتر بۆ هەمیشە لەگەڵ ئەودا دەبن و لە خۆیان ڕزگاریان دەبێت. ڕوانین و ڕوانگەیان دەگۆڕێت و، دڕك دەبێت بە گوڵ و، ژەهریش بە هەنگوین. ئای بە جلوبەرگی شڕ و دڕاویانەوە دەگەن بە چ پلە و پایە و باڵایەك!. وە کێ دەزانێت ڕۆژی چەند جار بە جوانییە جیاوازەکان سەریان سووڕدەمێنێت، چەند جار بە سەپرایزە خواییەکان دڵیان دادەخورپێت، چ ڕازگەلێك سەر لە حەرەمیان دەدات و، چەند ئاوڕلێدانەوە و ڕێزلێنان دەبینن کە داخراوە بە ڕووی نامەحرەمدا. کاتێك لە ئاوێنە جیاوازەکاندا تەماشای درەوشانەوە ڕەنگاوڕەنگەکانی

جوانیی ئەو دەکەن، ترپەی دڵیان دەگۆڕێت و لە هەر لێدانێکیدا وەك ئەوە وایە گوێیان لە ئەو بووبێت. لەڕاستیدا بیستران مافی ئەوە و، بیستن و هەوڵی بیستنیش ئەرك و فەرمانی ئێمەیە. لەبەر خاتری جددییەتی ئەم ئەرکە و عەشق و شەوقی ئەم فەرمانی ئاوێنەدارییەیە کە ڕێگاکان چەند هەوراز و نارەحەت بن، هێشتا سەبارەت بە ڕێبواران وەك حەوانەوە وایە لە باخچەکانی فیردەوسدا . لە سایەی ئەو ئاماژە و نیشانانەی کە لەلایەن ئەوەوە دانراون، مەودا دوور و درێژەکان دەگۆڕێن بۆ گەشتێکی بەتام و بەچێژ، ئەو هەڵدێر و بەربەستانەش کە وا دیارە نابڕرێن، بە جۆش و خرۆشی ویساڵ بە یەك جووڵە تەی دەکرێن و، نە هەست بە ماندووێتی ڕێ دەکرێت، نە بە ئازارەکانی ڕۆیشتن. ئارەزوو دەکەن ئەم ڕێگایانە هەرگیز تەواو نەبن.

ئەم ڕۆحانەی کە تەنها چاویان لە گەیشتنە بە خۆشەویست، لە بچووکیی جەستە و تەسکیی ماددییەت قوتاریان بووە و، بەردەوام ژیان لە هەرێمی بێپایان و ڕەنگینی مەعریفەتدا و لەناو باوەشی بەخششەکانی ئەودا بەسەر دەبەن. هەر تەنێك کە تەماشای دەکەن بە نامەیەك و مۆرێکی ئەوی دەزانن و ماچی دەکەن و دەیخەنە سەر سەریان و، هەمیشە لە سنووری چێژ و لەزەتە مەعنەوییەکاندا دەسووڕێنەوە. هەر لوتکەیەکی ناسین و خۆشویستن کە دەیگەنێ بە دواهەمین خاڵی دەزانن کە دەست بیگاتێ و، بە (الله اکبر) ئەو گەورە ڕادەگرن و بە (الحمد لله)ش سوپاسی خۆیانی پێشکەش دەکەن. بەڵام هەر دوای دوو هەنگاوی تر ڕووبەڕووی تاوبارانێکی چاوەڕواننەکراو دەبنەوە و خۆیان لە زەمزەمەیەکی جیاوازی مەعریفەت و چێژە ڕۆحانییەکاندا دەبیننەوە.

لە هەر مەنزڵێکدا کە پێی دەگەن درەوشانەوەیەکی جیاوازی جوانی دەبینن و سەرلەنوێ بە عەشق و شەوقەوە دەکەونەوە ڕێ بەرەو وێستگە نەزانراوەکان. لە ڕێگاکەیاندا جوانی بەدوای جوانیدا دێت و، نە جیلوەی جەماڵی ئەو تەواو دەبێت و نە ئارەزووی تەماشا کردنیش لە ڕۆحەکاندا.

بۆ ئەوانەی کە دەبینن و دەبیستن، عەشق و شەوق لەم ڕێگەدایە و ئەو دڵۆپ دڵۆپانەی ویساڵیش کە ئاماژە بە دەریا دەکەن، هەر لەم ڕێگەدایە. ئەوانەی لە دڵۆپدا دەریا و لە گەردیلەدا کاکێشان دەبینن، کێ دەزانێت چ دیمەنگەلێکی جیهانەکانی تر دەبینن و چ کۆمەڵە دەنگێکی نەبیستراو دەبیستن! چونکە ئامانجی بوون تەماشا کردن و خوێندنەوەی ئەمانەیە، هەر ئەمەشە نهێنی بەدیهاتنی مرۆڤ...

# کرێکارانی
# فیکر لە
# داهاتوودا

# کرێکارانی فیکر لە داهاتوودا

کرێکارانی فیکر لە داهاتوودا، دامەزرێنەرانی سبەینێ و ڕابەرانی نەوەکانی ئایندەن. دنیا بەو فیکرانەی کە ئەوان خەرمانیان کردووە سەرلەنوێ دادەمەزرێت و، داهاتووش بە پەیامی ئەوان ڕۆشن دەبێتەوە. ئەوان هەرگیز وەکو ئەو میراتخۆرانە نین کە زەحمەت و ناڕەحەتییان نەبینیوە، بەڵکو هەر شتێك بەدەست بهێنن هەزار ناڵەی لەپێناودا دەکێشن و، ئارەقی زۆری بۆ دەڕێژن. لەبەر ئەوە هەر شتێکیشیان دەست کەوت نرخی دەزانن و بەفیڕۆی نادەن. بەپێچەوانەوە، لەسەر دەستی ئەواندا یەکەکان دەبن بە هەزاران و، لە دڵی ڕووناکی ئەواندا، نەبوونی دەبێت بە منداڵدان بۆ هەبوون.

ئەوان هێندە بەلاشخۆر نین شتانی ئێستا هەڵبسەنگێنن و سوودی لێ وەربگرن. بەڵکو ئەگەر پێویست بکات هەر یەکێکیان وەك حەزرەتی موسا عەساکەی دەستی دەکێشێت بە ڕەقترین تاشەبەردردا و ئاوی لێ دەردەهێنێت. هەروەها دەیکێشێت بە شەپۆلە هەرە سامناکەکاندا و ڕێ و شوێن پیشانی ئەوانەی دوای خۆی دەدات.

ئەوان لە بەرامبەر دنیادا کەی پێویست بکات چاوەڕوان بن، چاوەڕێ دەکەن و، کەی پێویستی کرد هەڵمەت بەرن، وەك شێر دەردەپەڕنە مەیدان. گاە جوامێرانە وەك هەورەبروسکە دادەبەزنە سەر سنگی جیهان و، گاهـ بۆ ئەوەی زریان و ڕەشەباکان بەریان نەکەوێت، کەنار دەگرن و چاوەڕێی هاتنی وەرزی شەماڵە فێنکەکان دەکەن. خێرا و چاپووکن، بەڵام هەرگیز ڕەفتاری هەڵەشەیان لێ نابینرێت. بیرکردنەوەیان ڕووناك و کەسایەتییان دامەزراو و هەڵسوکەوتیان بە پێوەرە.

ئەوان ناترسن لەوەی پەیوەندیی لەگەڵ هەر چەشنە سیستەم و بیرکردنەوەیەکدا ببەستن. بەڵام ئەوەندەش هەیە کە دڵیان هەردەم وەك قیبلەنما ئاماژە بە میحرابەکەی خۆیان دەکات. بەڵێ، ئەگەر جوانترین تەوژمی فیکریی لەکۆتاییدا نەچێتەوە سەر هەرێمی تایبەت بە خۆیان، ئەوان خۆ خەریك کردن پێیەوە بە کارێکی بێسوود دەزانن. هەروەك خۆیان بەو ڕووبارانەوە سەرقاڵ ناکەن کە ئاوی بێستانی ئەوان نادات و نارژێتە گۆمی ئەوانەوە...

ئەوان بە ناوی نەتەوەکەیانەوە هێز لە حەقدا دەبیننەوە و هەمیشە هەوڵی ژیاندنەوەی حەق دەدەن. بەڵام هەرگیز ئەوە لەیاد ناکەن کە هێزیش پێگەی تایبەتی خۆی هەیە و حیکمەتێك لە بوونیدا هەیە. ئەگەر لە هەمبەر دوژمنەکانیاندا خاوەنی هێزێکی هاوتا نەبن، لێزانن و خۆیان دووچاری دۆڕان ناکەن. زیرەك و تێگەیشتوون، بەڵام سادە و خاو دیارن!..

لە دڵەوە وابەستەی ئەوانەن کە لەسەر هەمان ڕێگان. لەگەڵ

دوژمنەکانیشیان تابڵێی مرۆڤانە هەڵسوکەوت دەکەن و، هێندەش خاوەنی بەسیرەتن کە بتوانن بەرێوەیان ببەن. لە کەشوهەوای ئەواندا کە دڵ و ژێری دەستیان لەناو دەستی یەکدایە، نە دۆستان فەرامۆش دەکرێن، نە دوژمنانیش تەماع دەیانگرێت.

کاتێك تووڕە دەبن بەشی ئەوە نەرمن کە ستەم نەکەن و، کاتێکیش نەرمونیانن بایی ئەوەندە خاوەنی ئیرادەن کە لە دادپەروەری لا نەدەن. لە هەرێمی پیرۆزی ئەواندا نە نەڕەی ستەمکار دەبیسترێت نەناڵەی ستەملێکراو.

تێکۆشەر و دامەزراون. تا ئەو کاتەی دەگەن بە جەژن، نە ڕۆژوویان لە دنیا دەشکێت و، نە ئارەزووی چوونە بەهەشت بەسەریاندا زاڵ دەبێت. بەردەوام وەك بوغوردانێك بۆنی خۆشی جیهانە نەبینراوەکان بە دەوروبەریاندا بڵاودەکەنەوە.

ئەوان وەك دەستاوێژ وان لە نێوان ئەو کۆمەڵگەیەی تیایدا دەژین و حەقیقەتە مەزنەکانی ئەودیو ئاسمانەکان. ئەگەر دەستە شوومەکان هەزار و یەك جار ڕایانبوەشێنن و ماندووشیان بکەن، ئەوان هەرگیز ناپسێن. ئەوان، لەبەرئەوەی چەندین جار سنگیان کردووە بە سپێر لەبەردەم ئاگردا و، چەندین کەڕەت بەنێو مشار و چەکوشدا تێپەڕیون، نە لە خرانە ناو ئاگر دەترسن و، نە گوللە و بۆمبی ستەم دەیانترسێنێت و پاشەکشەیان پێ دەکات.

لە چاوی ئەواندا سەربەستیی ڕاستەقینە لەوەدایە ببن بە دیلی

خوا. لەبەر ئەوە هەر ناخۆشییەك لە ڕێی حەقدا بە نەفسیان بچێژن، بە نەشوەی پەرستشی دەزانن و چێژێکی ڕەهای لێ وەردەگرن. بەتایبەت ئەگەر بە تەواوەتی حەز و ئارەزووە مرۆییەکانیان تێپەڕاندبێت...

ئەوان هێندە خۆیان باش دەناسن و ئەوەندە سەرقاڵی لێپرسینەوەن لە نەفسی خۆیان، پشت بە گومانی باشی خەڵك و ئەو پلە و پایانە نابەستن کە پێیان دەبەخشرێت. نە گەورەیی سەرکەوتنەکان و نە ڕێز و ستایشی دەوروبەر، نایانخەڵەتێنێت و لە خۆیان بایی نابن. هەروەك چۆن کاتێك یەکەم ڕۆژ ئەو ئەرکە پیرۆزە خرایە سەر شانیان خاکی و خۆبەکەمزان بوون، ئەو ڕۆژەش کە هەر یەکەیان دەبن بە ئاڵایەکی شەکاوە لە گۆشەیەکدا، بەهەمان جۆر ڕەسەن و خانەدانن.

ئەوان، لە پاداشتی سەرکەوتنەکانیاندا چاوەڕێی پاداشت ناکەن لە نەتەوەکەیان و خۆیان ناخەنە حاڵەتی سواڵ کردنەوە. ئەگەر دەستکورت و نەبووش بن، هێشتا ئەم سواڵ کردنە ناشرینترین شتە بەلایانەوە. ئەم سواڵ کردنەی کە بریتییە لە سەندنەوەی چەندین قاتی ئەو شتانەی بە نەتەوە بەخشراون...

لەمێژە نیشانەی هەڵهاتنی ئەم جۆرە قارەمانانە لە ئاسۆماندا دەرکەوتووە و هیواداریین لە خوای خاوەنی میهرەبانی ڕەها نائومێدمان نەکات.

# وێنەی مرۆڤی فیداکار

مرۆڤی فیداکار، بە باوەڕ و هەڵسوکەوت و ئاسۆی بیرکردنەوەیدا پاڵەوانێکی تەواوی ڕۆح و مانایە. قووڵی و فراوانیی ئەو بە ئەندازەی هەگبەی زانیارییەکانی نییە، بەڵکو بەقەدەر دەوڵەمەندیی ناخ و، ڕوونیی ڕۆح و، نزیکییەتی لە خواوە. لە دیدی ئەودا نرخی ئەو زانیارییانەی کە وەك زانست دەخرێنە پێش چاو، تەنها لەوەدایە کە ببن بە دەلالی حەقیقەت. لە ڕوانگەی ئەودا ئەو زانیارییانەی -بەتایبەت ئەو زانیارییە نەزەرییانەی کە سوودی کردارییان نییە- یارمەتیمان نادەن بۆ تێگەیشتن لە بوون و بەدیهاتووان و مرۆڤ، هیچ جۆرە بەها و نرخێکیان نییە.

مرۆڤی فیداکار، کەسێکە هەمیشە ژیانی دڵ و ڕۆحی بەردەوامە و، سوورە لەسەر ئەوەی لە چڵکی ماددی و مەعنەوی خۆی بەدوور بگرێت و، هەردەم بێدارە بەرامبەر بە حەز و چێژە ماددییەکان و، نموونەیەکی باڵای خۆبەکەم زانین و خاکی بوونە و، بە بەردەوامی لە جەنگدایە لەگەڵ نەخۆشییەکانی چەشنی قین و نەفرەت و هەڵپە و حەسوودی و شەهوەت.

ئەو، هەموو ساتێك خولیای بەرزکردنەوەی "حەق"ی هەیە و، خەمخۆرێکە هەمیشە لە تاسەی ئەوەدا ئەو جوانییانەی کە لە جیهانەکانی مولك و مەلەکوتەوە وەریگرتوون بیگەیەنێت بە کەسانی تر و، هەتا بلێی ئارامگر و وریایە و، لەبری قسەکردن و ژاوەژاو، زیاتر مرۆڤێکی باوەڕدار و پڕ لە چالاکی و جوولەیە کە بەگوێرەی بیروباوەڕەکانی دەژی و، بەم ژیانەشی دەبێت بە نموونە بۆ کەسانی تریش. ئەو، بێ ئەوەی وەستان و ماندووبوون بناسێت هەردەم لە ڕۆیشتندایە.. ئەدەبی ڕۆیشتن بەرەو خوای گەورە فێری خەڵکانی تریش دەکات.. جیهانی ناوەوەی هەمیشە وەك ئاگردان کڵپەی دێت، بەڵام هەرگیز خەمی خۆی بۆ کەس دەرناخات و، قەت بیر لەوە ناکاتەوە کە بێگانە لە ئاهی سینەی ئاگادار بکاتەوە.. هەمیشە لە ناوەوە دەسووتێت و گەرمیش دەبەخشێت بەو دڵانەی کە هانای بۆ دەبەن.

ئامانجی مرۆڤی فیداکار هەموو کاتێك ئەودیو سنوورەکانی ئەم بوونەیە. ئەو، مرۆڤێکی ئیماندارە کە خۆی پەیوەستی ڕەزامەندیی خوا کردووە و، بە بەردەوامی گوزەر دەکات و سەروکاری لەگەڵ مەوداکانندایە و، تا ئەو ساتەی دەگات بە خۆشەویستەکەی وەك ئەسپی کوحەیلان بێ ماندووبوون ڕادەکات. لەم ڕاکردنەشیدا چاوی لە هیچ بەرژەوەندی و قازانجێك نییە.

مرۆڤی فیداکار، ئەوەندە لە ناخەوە وابەستەی حەقیقەتە، تەنانەت لە هەستان و دانیشتنیشیدا بیر لە بەرز ڕاگرتنی "حەق" دەکاتەوە لەسەر زەویدا و، کاتێك باسی حەقیقەت بێتە پێشەوە، بەوپەڕی خۆشحاڵییەوە ئامادەیە واز لە سەرجەم ئارەزوو و داواکانی بهێنێت. ئەو، سینە بۆ

هەموو کەسێك دەکاتەوە و، بە میهرەبانییەوە هەموان باوەش دەکات و، هەمیشە لە فریشتەی پارێزگار دەچێت لە کۆمەڵگەکەیدا. بەڵام جگە لە خوا چاوەڕێی هیچ شتێك لە کەس ناکات. بە هەڵسوکەوت و ڕەوشتی هەوڵ دەدات لەگەڵ هەموو کەسێك بگونجێت و، دەمەقاڵێ لەگەڵ کەس ناکات و، دوژمنایەتیش بەرامبەر کەس نانوێنێت. ئەگەر جاروبار بەپێی بیروڕا و ئیجتیهاد و جیهانبینی و مەشرەبی خۆی هەندێك هەڵبژاردنی جیاوازی هەبێت، هەرگیز ئەمە ناکات بە هۆکاری کێبەرکێ و مشتومڕ لەگەڵ کەسانی تردا. بەپێچەوانەوە هەرکەسێك خزمەت بە دین و نیشتمان و بیروباوەڕ بکات ئەم خۆشیدەوێت.. چەپڵە بۆ هەموو کەسێك لێ دەدات کە کاری بنیاتنەر بکات.. بەوپەڕی وریاییەوە هەوڵ دەدات ڕێز لە بیر و بۆچوون و پێگەی ئەوانی تر بگرێت.

مرۆڤی فیداکار، لەپاڵ هەوڵ و چالاکییەکانی خۆیدا، ئەوپەڕی گرنگی بە پاڵپشتی و عینایەتی خوایی دەدات.. لە هەر جووڵەیەکیدا بەدوای ئەو هۆکارانەدا دەگەڕێت کە پشتگیریی خوایی دەستەبەر دەکەن.. گرنگییەکی تەواو دەدات بەو یەکێتی و یەکڕیزییەی کە قورئانی پیرۆز کردوویەتی بە مەرجی عینایەتی خوایی.. ڕادەکات بۆ کارکردن لەگەڵ هەر کەسێکدا کە ئاڕاستەکەی ڕاست بێت.. لەم یەکێتی و ڕێکەوتنانەشدا شوێن بڕیاری زۆرینە دەکەوێت و زۆر جاریش ڕێیەك هەڵدەبژێرێت کە پێشتر ڕای لەسەری نەبووە. بیر لەوە دەکاتەوە کە ڕەحمەت لە یەکێتیدایە و، بە دوویەرەکی کەس ناگات بە هیچ شوێنێك، هەوڵ و کۆششی خۆی لەگەڵ هەر کەسێکدا یەکدەخات کە بتوانێت لێی نزیك ببێتەوە و، تێدەکۆشێت هەردەم کراوە بێت بەڕووی تاوەبارانی عینایەتدا.

مرۆڤی فیداکار عاشقی حەق و ڕەزامەندیی حەقە. لە هەر شوێنێك و لە هەر بارودۆخێكدا بێت، هەمیشە هەموو كاروبارەكانی پەیوەست دەكات بە ڕەزامەندیی ئەوەوە.. لە ڕێگەی ڕازی كردنی ئەودا هەڵپەیەك دەنوێنێت تا ڕادەی مردن.. وە بۆ گەیشتن بە ئامانجێكی وەها ئامادەیە هەرچی هەیە بەختی بكات و، دەست لە هەموو شتێكی دنیا و دوارۆژ بشوات. لە جیهانی بیر و ئەندێشەی مرۆڤی فیداكاردا هەرگیز جێگایەك نییە بۆ "من كردم" و "من سەركەوتوو بووم" و "من ئەنجامم دا"... ئەو، هەركەسێك ئەو شتانە بكات كە پێویستە بكرێن، وەك ئەوەی خۆی كردبێتی دڵخۆش دەبێت و، سەركەوتنی ئەوان بە سەركەوتنی خۆی دەزانێت و، لە پشت سەریانەوە دەڕوات.. پلە و پایەی ڕابەرایەتیش بۆ ئەوان جێدەهێڵێت. لە سەرو ئەمەشەوە، پێی وایە كە دەكرێت كەسانی تر لە خزمەت كردنی ئیمان و مرۆڤایەتیدا لەو شیاوتر و سەركەوتووتر بن و، زەمینەیەك ساز دەكات كە ئەوان بتوانن بە ئاسوودەیی تیایدا كاروبارەكانیان ئەنجام بدەن. پاشان خۆی هەنگاوێك دێتە دواوە و وەك "مرۆڤێك لەناو مرۆڤەكاندا" درێژە بە ڕۆیشتنی خۆی دەدات.

مرۆڤی فیداكار، لەبەرئەوەی هەمیشە لەگەڵ خۆیدا خەریكە و سەرقاڵی هەڵە و كەموكورتییەكانی خۆیەتی، هەرگیز ناپەرژێتە سەر ناتەواوییەكانی خەڵكی. نەك هەر خۆی سەرقاڵ ناكات بە كەموكورتی كەسانی ترەوە، بەڵكو لە هەموو دەرفەتێكدا وێنەی مرۆڤێكی نموونەیی بەرجەستە دەكات و، خەڵكان ئاڕاستە دەكات بەرەو ئاسۆ بەرزەكان و، دەبێت بە مۆدێلێكی جوان بۆ هەموان. چاوپۆشی لە كەموكورتی ئەوانی تر دەكات.. بە زەردەخەنە وەڵامی هەڵسوكەوتە نەرێنییەكانی ئەوانی تر

دەداتەوە، چاکە لە بەرامبەر خراپەدا دەکات و، ئەگەر پەنجا جاریش زویر بکرێت، بۆ یەك جاریش بیر لە شکاندنی کەسێك ناکاتەوە.

مرۆڤی فیداکار، ژیان لە بازنەی ئیمان و ئیخلاسدا بە یەکەم کاری تەمەنی دەزانێت و، بە گشت هەست و نەست و هەڵسوکەوتەکانی، خۆی یەکلایی کردووەتەوە بۆ ڕەزامەندیی خوا و پاڵەوانێکی حەقیقەتی وایە کە ئەگەر هەموو دنیا و "ماسیوا"ی بدرێتێ، هێشتا ئەو لە ئامانجەکەی پاشگەز ناکاتەوە، تەنانەت بە بەهەشتیش ناتوانیت ئاڕاستە و ڕێگای پێ بگۆڕیت.

مرۆڤی فیداکار هەرگیز ناکەوێتە پێشبڕکێ لەگەڵ ئەو کەسانەدا کە هەڵگری هەمان ئامانجن و لەسەر یەك ڕێ دەڕۆن.. هەرگیز بەرامبەر بەوان هەست بە حەسوودی ناکات.. بەپێچەوانەوە ناتەواوییەکانی ئەوان پڕدەکاتەوە و کەموکورتییەکانیان تەواو دەکات.. وە بەرامبەر ئەوان بەجۆرێك هەڵسوکەوت دەکات وەك ئەوەی ئەندامانی یەك جەستە بن. لە هەر بابەتێکی ماددی و مەعنەویدا و، لە پلە و پایە و ناوبانگ و کاربەدەستی و قسەڕۆیشتندا، هەردەم هاوڕێکانی پێش خۆی دەخات و، خۆیشی دەکشێتە دوای دواوە و، وەك دەلاڵی سەرکەوتنەکانی ئەوان هەڵسوکەوت دەکات و، چەپڵە بۆ تایبەتمەندییەکانی ئەوان لێ دەدات و، بە سەرکەوتنیشیان خۆشحاڵ دەبێت.

مرۆڤی فیداکار، ئەگەر زۆر جاریش کاروبارەکانی بەگوێرەی بیر و بۆچوون و چێژ و زەوقی تایبەتی خۆی بەڕێوە ببات، هەمیشە هەوڵ دەدات ڕێز لە بۆچوون و کرداری کەسانی تر بگرێت.. کراوەیە

بەرووی هاوبەشی و پێکەوەژیاندا.. لە هەستان و دانیشتنیشیدا بیر لەو ڕێگایانە دەکاتەوە کە یارمەتی دەدەن کاری هاوبەش بکات لەگەڵ ئەو کەسانەدا کە هەمان جیهانبینییان هەیە.. برەو بە پرۆژەی هاوبەش دەدات.. تێدەکۆشێت لەبری "من"، "ئێمە" دابمەزرێنێت.. جگە لەوەش، لەپێناو بەختەوەری کەسانی تردا ئامادەیە بەخۆشحاڵییەوە بەختەوەری خۆی فیدا بکات.. کاتێکیش ئەمانە دەکات، چاوەڕوانی هیچ ستایش و سوپاسێك نییە لە کەس.. تەنانەت چاوەڕوانییەکی لەم شێوەیە سەبارەت بە خۆی بە دارمان دەزانێت و، وەك چۆن لە مار و دوپشك دەترسێت، ئاواش لە ناو و ناوبانگ و دەرکەوتن هەڵدێت و، لەبیرچوون و لەبیرکران هەڵدەبژێرێت.

مرۆڤی فیداکار دەستدرێژی ناکاتە سەر کەس، هێرشیش بە هێرش وەڵام ناداتەوە. لە هەستیارترین بارودۆخیشدا خوێنساردیی خۆی دەپارێزێت و، هەرگیز دوا ناکەوێت لە دەرخستنی سەرجەم تایبەتمەندییەکانی مرۆڤی فیداکار. هەردەم بە چاکە وەڵامی خراپەکان دەداتەوە.. خراپە بە کاری خراپکاران دەزانێت و وەك نموونەیەکی باڵای چاکە ڕەفتار دەکات.

مرۆڤی فیداکار، لە چوارچێوەی قورئان و سوننەت و ویلایەت و تەقوا و عەزیمەتدا دەژی.. بەردەوام وریایە بەرامبەر ئەو هەستانەی کە دڵ دەمرێنن، لە چەشنی خۆپەرستی و خۆبەگەورەزانین و ناوبانگ.. لە بەرامبەر ئەو جوانییانەی کە دەدرێنە پاڵی، ئەو دەڵێت "هەموو شتێك لە ئەوەوەیە" و، دەیبەخشێت بە خاوەنی ڕاستەقینەی خۆی.. لەو کاروبارانەشدا کە وابەستەی ئیرادەن، لە "من" ڕادەکات و پەنا بۆ "ئێمە" دەبات.

مرۆڤی فیداکار لە هیچ کەسێك ناترسێت. لە هەمبەر هیچ ڕووداوێکدا تووشی پەشۆکان نابێت. پشت بە خوا دەبەستێت و باوەش بە هەوڵداندا دەکات و ڕام دەبێت بۆ حیکمەتی خوایی. وە هەرگیز لەو شتانە پاشگەز نابێتەوە کە بە ڕاستیان دەزانێت..

مرۆڤی فیداکار دڵی لە کەس ناشکێت، بەتایبەت ئەو کەسانەی کە دڵیان وابەستەی حەق و حەقیقەتە، ئەو لێیان زویر نابێت. هەر خراپەیەك لە هاوڕێکانی ببینێت لێیان دوور ناکەوێتەوە.. پەردەی شەرم و ئابڕوو نادڕێنێت.. شەرمەزاریان ناکات. نەك هەر شەرمەزاریان ناکات، بەڵکو لەسەر ئەوەی کە خراپەیەکی برایەکی بینیوە، خۆی بە تاوانبار لە قەڵەم دەدات و لێپرسینەوە لەگەڵ خۆیدا دەکات.

مرۆڤی فیداکار بەرامبەر بەو ئیماندارانەی کە هەندێك ڕەفتاریان دەگونجێت لێکدانەوەی جیاواز هەڵبگرێت، ئەو هەرگیز گومانی خراپیان پێ نابات. ئەو شتانەی دەیانبینێت و دەیانبیستێت ڕاڤەی باشیان بۆ دەکات و، هەرگیز تێبینیی خراپی نابێت لەسەریان.

مرۆڤی فیداکار، کاروبارەکانی بەجۆرێك ڕێك دەخات کە دەزانێت ئەم دنیایە خانەی تاقیکردنەوە و خزمەتە و شوێنی پاداشت و کرێ نییە.. هەردەم لێپرسراوێتی و ئەرکەکانی بەوپەڕی وردی و وریاییەوە ئەنجام دەدات.. سەرقاڵبوون بە ئەنجام و بەرهەمەوە بە بێ ڕێزی دادەنێت لە بەرامبەر خوای گەورەدا. ئەو، خزمەت کردنی دین و ئیمان و مرۆڤایەتی بە مەزنترین ئەرکی خۆی دەزانێت لە ڕێگای ڕەزامەندیی خوادا و، لەمەشدا هەرگیزاو هەرگیز هیچ پلە و لەزەتێکی ماددی و مەعنەوی بە نەفسی ڕەوا نابینێت.

مرۆڤی فیداکار، نە بە تێکچوونی سیستەم دووچاری نائومێدی دەبێت و، نە ئەگەر هەموو دنیاش دوژمنایەتی بکەن دەلەرزێت.. دان بە خۆیدا دەگرێت و، دەڵێت "ئەم دنیایە جێگای زویربوون نییە و شوێنی ئارام گرتنە". خۆی ڕادەگرێت و بۆ ڕزگاربوون لەو نەهامەتییانەی دووچاری بووە بەدوای ڕێگای ڕزگاریدا دەگەڕێت و، لە هەستیارترین بارودۆخیشدا ستراتیژی جیاواز بەرهەم دەهێنێت و، هەمیشە بەپێوە و بە ڕاوەستاوی دەمێنێتەوە.

لەم ڕۆژگارەدا کە بەها مرۆییەکان بە چاوی سووک تەماشا دەکرێن و، بیروباوەڕی ئایینی تێکشکاوە و، هەموو سوچ و قوژبنێك پڕە لە ناڵەی بەربادی و بەرەڵایی، جێی خۆیەتی جارێکی تر ئەوەمان یادبێتەوە کە لە هەموو شتێکی تر زیاتر و پتر لە هەوا و ئاویش، پێویستمان بەم جۆرە مرۆڤانەیە. بەڵێ، ئەمە یاد دەخەینەوە و خاڵی کۆتایی دادەنێین.

# ئەفسوونی ئیسلام

سەرگوزەشتەی مرۆڤ لەسەر زەویدا بە ئیسلام گەیشتووە بە ئامانجی خۆی و وەك پەیامێکی ڕزگاریی جیهانی جێگای خۆی کردووەتەوە. ئەو فەلسەفەیەی کە هەمیشە لە هەمبەر نهێنی و مەتەڵی بەدیهاتندا دەستکورت و لارەمل بووە، تەنها لە سایەی سیستەمە فیکرییەکانی ئیسلامدا توانیویەتی پشتی چەماوەی خۆی ڕاست بکاتەوە و لەژێر لێوەوە هەندێك شتی باش بڵێت. تەنە زەبەلاحەکانی ئاسمانەکان و زەوی بە نووری وەحی ڕوخساریان ڕووناك بووەوە و، لەوە دەرچوون کە چەند ماددەیەکی تێکەڵ و پێکەڵی ئاسمانی بن و، گۆڕران بە چەند پێشانگایەك کە شایانی تێڕامانن و، چەند کتێبێك کە پێویستە بخوێنرێنەوە. بە ڕێکوپێکی و سیستەمە وردەکەشیان بوون بە چەند تابلۆیەکی سەرسووڕهێنەر. بەم گۆڕانەیان و لە چوارچێوەی ئەو حیکمەتەدا کە تیایاندا دانراوە، بوون بە چەند زمانێکی گۆیای بانگەوازکار بۆ جیهانی پشت پەردەی سروشت. ئەو دڵە بەختەوەرانەی

کە لە ئاوی زولاڵی چەشمەی خزری ئیسلام بۆ تەنها جارێك قومێکیان خواردبێتەوە، چێژی ئەبەدییەتیان نۆشیوە و، تا ڕادەیەکی زۆر لەو تەنیایی و نائومێدییە ڕزگاریان بووە کە لە سروشتیانەوە سەرچاوەی گرتووە.

ئەوانەی کە لەناو ئیسلامی ڕاستەقینەدا ژیاون، لە جیهانی ڕۆحیاندا یەکی بەهەشتێکیان بنیاتناوە و وەکو فیردەوسییەکان چێژ لە ژیانیان دەبینن. نەك تەنها ئەوانەی کە مافی تەوایان داوە بەم ئایینە و لەگەڵیدا ژیاون، بەڵکو ئەوانەش کە بۆ تەنها جارێك بە سێبەرەکەی ئاشنا بوون، لە ترسی لەناوچوون و کۆلانی تاریکی بەڵێنە درۆیینەکان ڕزگاریان بووە و، ئەگەر بۆ ماوەیەکی کاتیش بوویێت هەناسەیەکی ئاسوودەیان هەڵمژیوە. ئەگەر ژیانێکی تر هەبێت بەرزتر بێت لە ئاستی ئەو ژیانەی کە ئیسلام بەڵێنی داوە بە شوێنکەوتووانی، ئەوا تەنها دەکرێت ژیانی ئیماندارانی بەهەشت بێت. خواوەندی بەدیهێنەر هەتا دواین لوتکە دەرگاکانی بۆ خستووەتە سەر پشت و، مۆری سولەیمانی لە دنیا و قیامەتدا لەسەر داناوە. هەر بۆیە لە سایەی ئەم ئیسلامەدا بووە کە پادشاکان هەناسەشیان دادپەروەرانە بووە و، هێز بووە بە پارێزەری حەق و، دەرگا بۆ زانست خراوەتە سەر پشت و، زنجیری ملی هەموو جۆرە بیر و بۆچوونێك پارچە پارچە بووە و، شەیتانەکان قۆچەکانیان فڕێداوە و بەرەو پەرستگاکان ملیان ناوە و، دەسەڵاتداران وازیان لە ستەم و دەستدرێژی هێناوە و ڕێگای فریشتەکانیان هەڵبژاردووە.

لە سایەی ئەو حیکمەتەدا کە لە ڕۆحی ئیسلامەوە هەڵدەقوڵێت

-دەکرێت پێشی بوترێت فەلسەفەی ئیسلام- ڕای گشتی ڕەنگی گۆڕاوە و، سەرزەوی بووە بە هەرێمێکی ڕۆشن. وەك بڵێی بوونەوەران و ڕووداوەکان بوون بە چەند وتاربێژێکی گۆیا و، خاك حاڵەتی دایکێکی وەرگرتووە کە هەموو شتێك بە میهرەبانییەوە دەنێت بە سنگیەوە، ئاو بە دەنگە شیرینەکەی مۆسیقای جاویدانی و بەیەکگەیشتن بەگوێماندا دەچپێنێت و، شاخە بەسام و شکۆکان و دەشتە خاکی و خۆبەکەمزانەکان، بوون بە دەنگ و هەناسەی قووڵییەك کە زۆر لەسەروو توانای ماددییانەوەیە. باخ و باخچە ڕەنگاوڕەنگەکان بە زەردەخەنەوە بۆمان دەڕوانن و، گوڵەکان سەخاوەتمەندانە نایابترینی جوانییەکان بە دڵ و چاومان دەبەخشن و، سەرسامان دەکەن. فراوانترین چێژەکانی "هەبوون" بە ڕۆحمان دەچێژن و، جوانترین و ناوازەترین بەختەوەری پێشکەشی ئەو بەختەوەرانە دەکەن کە خۆیان تەسلیمی خوا کردووە.

ئەو بەدبەختانەی تێنەگەیشتوون لەوەی کە ئیسلام گەورەترین دیاری بەدیهێنەرە بۆ مرۆڤایەتی، -ئەمە لەوانەیە هەندێك جار لە بڕیارێکی پێشینەوە سەرچاوە بگرێت، یاخود هۆکارەکەی ئەو موسڵمانانە بن کە لەگەڵ ئیسلام یەکناگرنەوە و بوون بە نموونەیەکی خراپ- لە پەیامی ئەو تێناگەن و، هەست بەو جیهان و ژیانە باڵایە ناکەن کە ئیسلام بەڵێنی داوە. تەنانەت کەسانی لەم جۆرە ئەگەر بە دەوروبەریشیدا بێن و بچن، هێشتا ئەم ئەنجامە نالەبارە ناگۆڕێت. زۆر نزیکن، بەڵام لە دوورەکان دوورترن. هەردەم تەماشای دەکەن، وەلێ لە ڕوانینەکانیاندا داڵغەیان ڕۆیشتووە و، هەرگیز ناتوانن لێی تێبگەن. نزیکی بووە بە هۆکاری دووری بۆ ئەوان، بینینیش بووە بە هۆی هەست نەکردن! بەڵام چیمان لە

دەست دێت؟! ژیان ئاوایە..! درِك ئەگەر لە تەنیشتی گوڵیشەوە بێت هەر درِکە و لەناودەچێت. ئەگەر قەلەباچکە لە باخچەی گوڵاندا و لەناو بولبولانیشدا بێت، هەر بە دەنگەکەی خۆی ئاشکرا دەکات. ژمارەی ئەوانەی نەفرەت لە ڕووناکی دەکەن کەم نین.. هەموومان لێرە و لەوێ کەسانێکمان بینی کە شەڕ لە دژی ڕێسا دەکەن.. هەر کاتێك بیرم دەکەوێتەوە کەسانێك هەن بە بۆنی گوڵ تێکدەچن و دەبوورێنەوە، بێزم دێتەوە.. بەکورتی هەرکەسە و کردارەکانی بەگوێرەی کەسایەتییەتی، والسلام...

ڕۆحێکی ڕۆشن کە ئیسلامی ناسیوە و لەناویدا دەژی، لە هەموو بوونەوەرێکدا بانگەوازی جاویدانی دەبیستێت و بە نەشوەی ئەبەد دەخرۆشێت.. ئەوانەی پێ دەنێنە هەرێمی ئاسوودەی ئەوەوە قاچیان دەبێت بە سەر، ئەو ڕوخسارانەی کە بە خۆشەویستی و ترسەوە لە سوجدەدا و لەو جێگایەدا کە نێوچاوان و سەری پەنجەکان لە یەك ئاستدان و، لە زەوی دەخشێن، ڕۆژانە چەند جارێك لەگەڵ فریشتەکان ئەسپ تاو دەدەن.

ئەو تاجی سەرانەی کە خۆیان ڕادەستی ئیسلام نەکردووە ناقۆڵا و کاتین و، ئەو وتە و وشانەش کە ئەو وەکو سەرچاوەیەك بەکارناهێنن، جیاوازییان نییە لەگەڵ ئەفسانەدا.. ئەو دڵانەی بەو بەخێو نەکرێن بۆش و، ئاسۆشیان تاریکە. ئەمانە ئەگەر جاروبار ببریقێنەوە و چاوی هەندێك بەر شەوارە بخەن، هەرگیز بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ ناتوانن بە درەوشاوەیی بمێننەوە، ئەوە هیچ کە ناتوانن چواردەوریان ڕووناك

بکەنەوە. لەباوەش گرتنی هەموو کاتەکان و کاڵ نەبوونەوە بەدرێژایی سەردەمەکان، پەیوەندی بە ئەندازەی تێپەڕاندنی کات و بەرزبوونەوە بەسەریدا هەیە. ئەو وشە و بۆچوون و سیستەمانەی کە ناتوانن کات و شوێن تێبپەڕێنن، درەنگ یان زوو ماوەی خۆیان پڕدەکەنەوە و پاشان وەك گەڵای پاییز دەوەرێن و لەناودەچن. بێگومان ناو و خاوەنەکانیشیان لەگەڵ خۆیان ڕاپێچ دەکەن.

ئیسلام هەم جێگیرە و هەم گۆڕاو. ئەو، وەك درەختێك وایە کە ڕەگەکانی لە ناخی زەویدایە و هێندە بەهێزە بە هیچ زریانێك نالەرزێت، لقەکانیشی بە هەموو لایەکدا بڵاوبوونەتەوە و چوار وەرزەی ساڵ میوەی تەڕ و پاراو دەبەخشێت.

پوختە و کاکڵەی چێژە دنیایی و قیامەتییەکان لەودایە و، ئەفسوونی ژیانی هەتاهەتاییش هەر لە هەگبە دەوڵەمەندەکەی ئەودا حەشار دراوە. خۆر لەچاو ئەو ڕووناکییەدا کە ئەو بە جیهانی بەخشیوە وەك بریسکەیەك وایە و، باخەکانی ئیرەمیش لەچاو ئەو باخچانەی مەعنادا کە ئەو لە دڵەکاندا سەوزی دەکات، وەك داستانە درۆیینەکان وایە.. لە بەرامبەر ئەو فراوانییەی کە ئەو بە ژیری و لۆجیك و هەستەکانمانی دەبەخشێت، گەردوون وەك داڵانێکی تەسکی لێ دێت.

هەموو ئەو وشە و بیرکردنەوە و تیشکە تەڕ و تازانەی کە ئیسلام بە بیر و بۆچوونی مرۆڤایەتی بەخشیوە ئاسمانین و، هیچ یەکێکیان لە سەرچاوەیەکی ترەوە وەرنەگیراون و، بە بۆچوونەکانی تر گەورە نەبوون و، بە ڕووناکییە بێگانەکان ڕەنگیان تێك نەچووە و، بە سەرچاوەکانی تر

لێڵ نەبوون و، فتیلەکەی بە چراکانی تر دانەگیرسێنراوە. بەپێچەوانەوە هەر تیشك و بەرەکەت و جوانی و چێژێکی ئەو بریتین لە کۆمەڵێك میوەی دەست لێنەدراوی ئەودیوی ئاسمانەکان. ئەگەر دوژمنایەتیی دوژمنانی و بڕیارە لە پێشینەکانیان و، نەزانی و بێوەفایی دۆستانی نەبووایە، ئەمڕۆ سەرجەم مرۆڤایەتی لە دەوری سفرە ئاسمانییەکەی ئەو کۆدەبوونەوە و، دەستیان لەناو دەستی یەکتردا دەبوو. دوژمنان لەسەر کەللەڕەقی سوورن و دۆستانیش ئاسۆی ئەویان لەکەدار کرد. ئەویش لە بەرامبەردا ئێمەی لە بەروبوومە ئاسمانییەکانی خۆی بێبەش کرد. وەك مرواریییەك کشایەوە ناو سەدەفەکەی و خۆی شاردەوە. خۆر ڕووناکی دەبەخشێت بەوانەی کە ڕووی تێدەکەن، گوڵەکانیش هەتا ڕوویان لە خۆر بێت و چاو نەنووقێنن لە ئاستیدا لەم ڕەنگ بۆ ئەو ڕەنگ باز دەدەن. درەختەکان بەقەدەر ئەو پەیوەندییەی کە بە خاك و ئاو و هەواوە هەیانە زیندوو دەبن و دەنەخشێن.. هەموو شتێك بە ئەندازەی ڕووتێکردن و نییەتەکەی شەرەفمەندی ئاوڕلێدانەوە و بەرەکەت دەبێت. ئەگەر دڵەکان بۆ ئیسلام گوێ هەڵنەخەن، ئەویش دەنگی خۆی ناگەیەنێت. ئەگەر کردار و ڕەفتارەکان فراوانی و قووڵی نەبەخشن بە وشەکان، ئەویش دەنگی کز دەبێت و ئاوڕ لە ڕۆحەکان ناداتەوە. وتە، بە ئەندازەی فڕینی بە دوو باڵی کردار و ڕەفتار، جۆش و خرۆش دەخاتە نێو دڵانەوە و، هەموو سنوورەکان دەبڕێت و دەگات بە گشت توانا و لێهاتنێك. ئەو دڵە موبارەکانەی کە بە ئیسلام لێ دەدەن و، لە هەستان و دانیشتنیاندا بە جۆشی ئەوەوە دەژین، ئای چ قەڵاگەلێکیان گرتووە و، چ شارانێکیان فەتح کردووە و، چ شارستانییەتێکی بەویژدانیان دامەزراندووە.!

ئێمەومانان کە لە چەند ڕۆحێکی شڕۆڵ و شپرزە پێکهاتووین، چاو و دڵمان لەگەڵ ئیسلامدایە و، ئەگەر بمرین، حەز دەکەین لە باوەشی ئەودا گیان بدەین و، ئەگەر بژین، دەخوازین تەنها لە هەرێمی ئەودا هەناسە بدەین. ئێمە وزەی ژیان و گەرمیمان لەوەوە وەردەگرین و عەشق و شەوقی ژیانیشمان هەر لەوەوەیە. چونکە لەم جیهانە فانییەدا کە هەموو شتێك دەڕمێت و لە یادەوەرییەکاندا ناوی دەسڕێتەوە، تەنها ئەوە کە بە بێ لەرزین لە شوێنی خۆی ماوە و، لەناو ئەو هەموو بەهایانەدا کە زەرد هەڵگەڕان و وەرین، تەنها ئەو بە تەڕ و پاراوی ماوەتەوە. لە هەر شوێنێك ئاڵای ئەو بە هەموو ڕەنگەکانیەوە بشەکێتەوە، لەوێ تامی ئاشتی و ئاسایش دەکرێت. لەو هەرێمانەدا کە وتاری ئەو دەخوێنرێنەوە، بەها مرۆییە جیهانییەکان لەژێر پارێزگاریدان. ئەو، بریتییە لە سێبەری یاسا و ڕێسای ئاسمانەکان لەسەر زەوی و، وێنەیەکی ڕەنگاوڕەنگی دنیای فریشتەکانە لە جیهانی جیسمانییەتدا. ئەوانەی کە بە ڕیتمی ئەو هەڵدەستن و دادەنیشن، لەگەڵ هاوسەنگیی گشتی گەردووندا دەگونجێن و، پارێزراو دەبن لە پێکدادان لەگەڵ بوونەوەراندا.

ئەو، بە وتە تازە و گەوهەرە زێڕینەکانی چنراوێکی وەهایە کە لەڕووی ڕێسا و یاساکەیەوە، نە کەس بە نەخشەکانی دەگاتەوە و نە جوانیی گرێکانی بە کەس لاسایی دەکرێتەوە. لە ڕێگەی ئەوەوە کاتێك گوێ لە تریەی دڵمان دەگرین، ئاهەنگی ئاسمانەکان و ئەودیوی ئاسمانەکان دەبیستین. بەهۆی نهێنیی پەیوەندی کردن بەوەوە جیهانی دڵمان لە ئاسمانەکان فراوانتر دەبینین و، بەترسێکی شیرینەوە هەڵدەلەرزین. هیچ سیستەمێکی ڕۆحی و هیچ تەوژم و هیچ فەلسەفەیەك ناتوانێت ئەو قووڵی و گەرمی و نەرمییەی

ئەو بەخشیویەتی بە ڕۆحەکان، ببەخشێت. خوا بەختەوەری ڕۆح و جەستە و، ماددە و مانا و، دنیا و قیامەتی لەودا داناوە.

ئەوانەی گوێ بۆ زمانی ویژدان هەڵناخەن، لەو تێناگەن.. ئەوانەش کە بە چاوی دڵ تەماشای ناکەن، وەکو خۆی نایبینن.. غەزالی گوتەنی "عەقڵی مەعاش ناگۆڕێت بە عەقڵی مەعاد." وەك مەولانای ڕۆمیش دەفەرموێت "عەقڵی تورابی ناگۆڕێت بە عەقڵی سەماوی." تەنانەت بەرزترین عەقڵەکانیش لە بێعەقڵی ڕزگاریان نابێت. مرۆڤایەتی لەوەتەی هەیە لە ناوەندی هات و هاواری دژایەتی نێوان عەقڵ و دڵدا ژیاوە. ئەگەر ئەمڕۆش بە "شەوی زاوایەتی" یەکی نوێ، ژیری و دڵ نەکەین بە هاوسەری یەك، وا دیارە ئەم دژیەکییە ناوەکییە بۆ ماوەیەکی درێژتریش بەردەوام دەبێت.

# بەزەیی

بەزەیی یەکەم هەوێنی بوونەوەرانە. بەبێ ئەو هەموو شتێك کەندەڵان و هەوراز و تێکەڵ و پێکەڵە. هەموو شتێك بە بەزەیی هاتووەتە بوون، بە بەزەیی درێژە بە ژیانی دەدات، بەهۆی بەزەییەوە ڕێکوپێکە و یاسا و ڕێسا گرتوویەتییەوە.

بەهۆی پەیامی ڕەحمەتی ئەودیو سنووری ئاسمانەکانەوە، زەوی گەیشتووە بە ڕێکوپێکی و، ئاسمانیش ڕێسا و یاسای وەرگرتووە. هەر لە گەردیلەوە هەتا گەلەستێرەکان، لە سایەی بەزەییدا، گەیشتوون بەم ڕێکوپێکی و سازان و جوانییە سەرسوورهێنەرەی ئێستایان.

هەموو شتێك بەم جموجوڵ و هاتوچۆیەی ئێستای، پرۆڤەی ئەو حاڵەت و شێوەیە دەکات کە لە ئەبەدییەتدا دەیگرێتە خۆ. وە هەموو بەدیهاتووان بەم ئاڕاستەیەدا لە هەوڵ و کۆششدان. لە هەموو جووڵەیەکدا ڕێکوپێکی و یاسا نمایانە و، لە هەر لەرزەیەکدا بەزەیی دەدرەوشێتەوە.

لە ئاسکیی هەوای لەرزۆکدا، لە سەمای جووڵەی ئاودا، ئایا دەکرێت ئەم بەزەییە داستانئامێزە نەبینین کە هەتا بەر لووتمان و تا بەردەم پێمان هاتووە؟

هەور بە باڵەکانی بەزەیی بەژوور سەرماندا دێت و دەچێت. باران وەك سوارچاکێکی فریادڕەس لە منداڵدانی هەورەوە دەردەپەڕێت و بەهانامانەوە دەگات. هەورەبروسکە و هەورەگرمەکان بە خۆیان و هەزار و یەك دەنگ و ڕەنگەوە مژدەی ئەو ڕەحمەتە دەهێنن. وە هەموو گەردوون بە هەموو شتێکی ناویەوە دەبێت بە غەزەلخوانی بەدیهێنەری خاوەن بەزەیی ڕەها. دەریا و وشکانی، درەختەکان و گژوگیا، ڕوو بە ڕوو و شان بە شان، بە وشە و دەنگی جیاواز ئەم گۆرانی بەزەییە دەڵێنەوە.

سەیری ئەو کرمە بکەن! لەژێر پێدایە و زۆر پێویستی بە بەزەییە، بەڵام ئەو بەم حاڵەیەوە لە ڕێگایەکدایە کە بەزەیی دەبەخشێت بە چەندین شتی تر، ڕێبوارێکی ماندوونەناسە. خاکی میهرەبان باوەشی بۆ دەکاتەوە. ئەویش لەم باوەشە گەرمەدا هەزاران گەرا دادەنێت. خاکی دایك بەمانە هەناسە دەدات، هەڵدەئاوسێت، دەپیشێت و پێدەگات. خاك بۆ کرم ڕەحمەتە و کرمیش بۆ خاك. ئایا چی بەو نەزانانە بڵێین کە ئاگر بەردەدەنە گژوگیا و ڕەگەکان و بە حسابی خۆیان وا دەزانن خاکەکە بەپیز دەکات؟ مرۆڤی داماو! تەنانەت ئاگای لەوە نییە بێ بەزەییانە لەگەڵ خاك و کرم ڕەفتاری کردووە...!

ئنجا تەماشایەکی ئەو هەنگە بکەن کە جیلوەی لەسەر هەزار و یەك گوڵ نمایانە و، لەو کرمی ئاوریشمە بڕوانن کە خۆی لەناو قۆزاخەکەیدا

حەشار داوە! لەپێناو بەشداری کردن لە ئۆرکێسترای بەزەییدا بەرگەی چی دەگرن و شان دەدەنە ژێر چ کارێك! ئایا دەکرێت ئازار و ناڕەحەتی ئەم مەردە پاڵەوانانە نەبینین کە لەپێناو بەخشینی هەنگوین بە ئێمە و دروست کردنی بەرگی ئاوریشمی بۆ ئێمە، دەیکێشن؟

ئەی ئایا هەرگیز بیرتان لەوە کردووەتەوە کاتێك مریشك لەپێناو ڕزگار کردنی جووجەڵەکەی بەرەنگاری سەگ دەبێتەوە، چ قارەمانێکی شەفەقەتە؟ یان سەرنجتان لەو دڕندە برسییە داوە کاتێك ئەوەی دەیدۆزێتەوە دەرخواردی بێچووەکەی دەدات، چ پاڵەوانێکی فیداکارە...؟

لەم جیهانەدا هەموو شتێك بەزەیی دەڵێتەوە و پەیمان و بەڵێنی بەزەیی دەچێنێت. بۆیە دەکرێت وەك سەمفۆنیایەکی بەزەیی لە بوونەوەران بڕوانین. دەنگ و هەناسە جیاوازەکان، نەغمە تاك و جووتەکان، لە ڕیتمێکی هێندە هاوسەنگدان لەگەڵ یەکتر، مەحاڵە نەیبینین و تێنەگەین. پاشان بینینی ئەو زاتەی کە لە پشتی ئەم بەزەیی و ڕەحمەتە پارچە پارچانەوەیە و، ئەم کۆرسە ڕازنامێزە بەڕێوە دەبات، ئەو زاتەی کە هەموو شتێکی بە ڕەحمەتی ڕەهای خۆی داپۆشیوە...

وەیل بۆ ئەو ڕۆحە بەدبەختانەی شتێك لەمانە تێناگەن...!

مرۆڤیش لە بەرامبەر هەموو ئەم ڕووداوانەوە، ئەرکی سەر شانی ئەوەیە کە بە شعوور و ئیرادەی، بە تێگەیشتن و بیرکردنەوەی، چڕببێتەوە لە تێگەیشتن لەم ڕەحمەتە بێسنوورەدا و، ئەویش هەستێت بە تێکەڵ کردنی نەغمەی تایبەتی خۆی لەگەڵ سەمفۆنیای بوونەوەراندا.

مرۆڤ لێپرسراوە لەوەی بەزەیی بێتەوە بە مرۆڤەکاندا و، بەو کۆمەڵگەیەدا کە تیایدا دەژی و، تەنانەت بە هەموو زیندەوەراندا. ئەو لەم ڕێگایەدا بە ئەندازەی بەزەییەکەی بەرز دەبێتەوە و، بەئەندازەی کەوتنی بۆ ناو ستەم و بێ ویژدانی و دڵڕەقیش نزم دەبێتەوە. بەڵێ، تلێر دەبێتەوە و دەبێت بە لەکەی ڕەشی ناوچاوانی مرۆڤایەتی.

لە ڕاستگۆترین مرۆڤەوە دەبیستین کە ئافرەتێکی خراپەکار لەبەر ئەوەی بەزەیی هاتووەتەوە بە سەگێکی تینوودا و ئاوی داوەتێ، بەرەو بەهەشت بەرز دەبێتەوە و، یەکێکی تریش کە دەبێت بە هۆکاری برسی کردن و تۆپینی پشیلەیەك، تلێر دەبێتەوە بۆ ناو شیوە قووڵەکانی دۆزەخ.

بە بەزەیی بن، تا شایانی بەزەیی بن و بەسەرتاندا ببارێت! کەسێك لەسەر زەوی خاوەنی بەزەیی بێت، لە جیهانەکانی ئەودیو ئاسمانەکانەوە هەزاران مژدەی بۆ دێت.

پێشینانمان چونکە لەم نهێنییە تێگەیشتبوون، لە هەموو جێگایەکدا هەزار و یەك خێرەتی بەزەییان هەڵدا. لە بەزەیی هاتنەوە بە مرۆڤدا تێپەڕین و، چەندین ڕێکخراویان دامەزراند بۆ پاراستنی ئاژەڵان. ئەمە هیچی تر نییە جگە لەوەی هەستی قووڵی بەزەیی لە ناخی ئەواندا، بووە بە کەسایەتی و خوویان.

چۆلەکەیەکی قاچ شکاو یان لەقلەقێکی بریندار، خوا دەزانێت جەرگی چ قارامانێکی بەزەیی هەڵقرچاندووە و، تا لە کۆتاییدا ئیلهامی دروست کردنی هێلانەی بۆ هات، بۆ ئەو باڵندە غەریبانەی

کە نەیانتوانیوە بگەن بە مەنزڵ، وەك ئەوەی خانەی بەساڵاچووان بنیات بنێت.

ئاخ! خۆزگە ئەوان چەند بەزەییان بە ئاژەڵاندا دێتەوە، ئێمەش ئەوەندە بەزەییمان بە مرۆڤی خۆماندا بهاتایەتەوە... هەیهات! وەك چۆن لە هەمبەر خۆمان بێ بەزەیین، نەوەکانیشمان بە هەستی بێباکی و بێبەزەیی وێران کرد. بەڵێ، ئێمەین لێپرسراوی ئەو کەشوهەوا کۆمەڵایەتییەی کە هەزار و یەك ڕووداوی خنکێنەر باڵی کێشاوە بەسەریدا و چیتر مرۆڤ ناتوانێت لەناویدا بژی.

ئنجا شتێکی تریش هەیە کە هەستی بەزەیی بە بێ پێوەر بەکاردەهێنرێت و کەڵکی خراپی لێ وەردەگیرێت. ئەمەشیان بەقەدەر بێ بەزەیی، بەڵکو لەو زیانبەخشتر و ناشرینترە.

ئەگەر بەزەیی لە شوێنی خۆیدا بەکاربێت وەك ئاوی حەیات و ئیکسیر وایە. وەلێ ئەگەر بێت و کەڵکی خراپی لێ وەربگیرێت، دەبێت بە ژەهر و زەققوم. لە بناغەشدا پێویستە لەم دەستوورە تێبگەین. کاتێك ئۆکسجین و هایدرۆجین بە ئەندازەیەکی دیاریکراو یەکدەگرن، ماددەیەکی ژیانبەخش پێکدەهێنن. بەڵام ئەگەر ئەم ئەندازەیە تێکبچێت یان جیاببنەوە، دەگەڕێنەوە بۆ دۆخی گڕگر و سووتێنەری پێشوویان. بە هەمان جۆر هەم دۆزی بەزەیی و هەم ئەو کەسەش کە بەزەیی بەرامبەر دەنوێنرێت زۆر گرنگە. "ئەگەر بەزەیی بەرامبەر بە دڕندەیەك بنوێنرێت، هەم ئیشتیهای دەبزوێنێت و هەم لە کۆتاییشدا داوای کرێی چنگ و نینۆکەکانی دەکات." بەزەیی هاتنەوە بە تاوانباردا، ئەوەندەی

تر دڕەندەی دەکات و هانی دەدات بۆ دەستدرێژی کردن بۆ سەر کەسانی تر. بەزەیی بەرامبەر بە کەسێك نانوێنرێت کە وەك مار چێژ لە پێوەدان دەبینێت. بەزەیی هاتنەوە بە ئەودا، واتە بەخشینی بەڕێوەبردنی دنیا بە کۆبراکان...

بەزەیی هاتنەوە بە کەسانی خوێنڕێژ و خوێنمژ و خوێنخۆردا، ترسناکترین ستەم و ڕەفتاری بێ بەزەییانەیە بەرامبەر بە ستەم لێکراوان و ماف خوراوان. حاڵەتێکی لەم جۆرە، لە بەزەیی هاتنەوە بە گورگ و گوێ نەدان بە مافی مەڕەکان دەچێت. ئەمە ئەگەر چی گورگەکان دەخاتە پێکەنین، بەڵام هەموو دانیشتووانی ئاسمان دەخاتە گریان.

# بەختەوەریی

بەختەوەریی یارێکی خۆشەویستە هەموو کەسێك بیری دەکات و ئامانجێکی هێندە باڵایە کە هەموو جۆرە فیداکارییەك دەهێنێت لەپێناویدا بکرێت. کەسێك نییە لەناو مرۆڤدا بەختەوەری نەوێت. بەڵام بەختەوەری چییە؟ ئەمە پرسیارێکی یەکجار دژوارە!..

بەگوێرەی یۆنانییەکان عەشق و سەودا و، بەپێی قەیسەر ناو و ناوبانگ و، بەڕای قارونیش بریتییە لە ماڵ و سامانی بێسنوور. بەڵام لەڕاستیدا هیچ یەکێك لەمانە نە بەختەوەری ڕاستەقینەن و نە یەکێکیشن لە هۆکارەکانی. ئەوانەی کە لەم ڕێگایانەدا بەدوای بەختەوەری ڕاستەقینەدا دەگەڕێن، هەمیشە خەڵەتاو و مایەپووچ دەرچوون.

بەختەوەریی ڕاستەقینە ڕزگاربوونی بیری مرۆڤە لە پەرێشانی و پەرتەوازەیی و، گەیشتنی دڵی مرۆڤە بە ئاسوودەیی و کامەرانی. ئەوانەی لە کەناری دەریاکان و لوتکەی چیاکان و شوێنی چەپەك و

تەنهادا بۆی گەڕاون، بەهەڵەدا چوون. هەرچەندە بۆ کەسانی ئاسایی کە ناتوانن بە ڕێگای تری جگە لەمانە ئاسوودەیی بە ڕۆحیان ببەخشن، لەوانەیە ئەمانەش بە چەند هۆکارێك دابنرێن. بەڵام بەختەوەری ڕاستەقینە هەرگیز پێویستی نە بە کات و نە بە شوێنە. ئەو لە هەموو جێگایەکدا لەگەڵ مرۆڤە و، ئەم یارە پیرۆزە ڕادەستی ڕووناکی ناخ و ئیرادەی ئەو کراوە. هەموو مرۆڤێك هەر کاتێك بیەوێت دەتوانێت ڕۆحی بدات لە شەقەی باڵ و، بکرێتەوە بەڕووی هەرێمە بێسنوورەکانی دڵدا و، بگات بە جیهانگەلێك کە لە تەماشا کردنیان تێر نابێت و، ئەو بەختەوەرییە بەدەست بهێنێت کە حەسرەتی بۆ کێشراوە. بەتایبەت بۆ کەسێك کە خەزێنەی دڵی پڕ بێت لە بیرکردنەوەی پاك... وەك (بۆیس) دەڵێت: "چەند بەختەوەرە ئەو کەسەی لە قووڵاییەکانی ڕۆحیدا میحرابێکی لەم جۆرەی هەیە!.."

بەڵێ، بۆ ئەوەی مرۆڤ بەختیار بێت پێویستە سەرەتا ئامێرەکانی ڕۆح بخرێنە گەڕ و، دڵیش پڕچەك بکرێت بە بیرکردنەوە پاکەکان و، پاشان دەبێت یادگارییە هەڵفڕێنەرەکانی ڕابردوو لەگەڵ ئومێدە بەجێ و ماقوڵەکانی داهاتوو پێکەوە موتالا بکرێن، تا لە سایەی ئەمەدا مرۆڤ لە خراپەکان پارێزراو بێت.. ئنجا هەستە شەهەوانییەکان بەریان پێ بگیرێت و هەستە بالاکانی بۆ زیاد بکرێت، تا هەموو چرکەساتێکی ژیان فەزیلەت بەدەست بهێنێت. چونکە تاقە دەستووری ژیانی ئەخلاقیی فەزیلەتە. ئەو بەختەوەرییەش کە بەدویدا وێڵین ناکرێت دوور لە فەزیلەت بیری لێ بکەینەوە و، لە ڕوویەکەوە بریتییە لە ئەنجام و پاداشتی ئەو.

بیرکردنەوە لە ڕەزامەندیی خوا ئەو تاقە شتەیە کە پەرواز بە ڕۆح

دەکات و دڵیش بە زیندوویی ڕادەگرێت. ئەگەر فیکرێکی باڵای لەم شێوەیە نەبێت، باس کردنی بەختەوەریی بێ مانا و ناوەڕۆکە.

پێغەمبەرمان کە مۆری بەختەوەریی داوە لە کاروانی ئیمانداران و بوونەوەرێکی ناوازە و بێوێنەیە، بەم تایبەتمەندییانەی خوارەوە، هەم خاوەنی فەزیلەت بوو، هەم بەختەوەر بوو: ئەو، هێندە دامەزراو و خاوەن ئیرادە بوو، بەدرێژایی ژیانی بۆ یەك جاریش شتێکی بە باش نەزانی کە خوای گەورە بە چاك و باشی نەزانیبێت. ئەوەندە ڕاست و دروست بوو، تەنانەت لە شتی بێ بایەخیشدا ناحەقیی لە کەس نەکردووە. ئەوەندە خووی بە جیهانە باڵاکانەوە گرتبوو و هێندە تێربووبوو بە درەوشانەوە خواییەکان، هەرگیز لەزەتی بەسەر فەزیلەتدا هەڵنەبژارد. خاوەنی تێگەیشتن و بیرکردنەوەیەکی هێندە تیژ و بەرز بوو، بۆ یەك جاریش لە جیاکردنەوەی چاکە لە خراپە نەکەوتە گومانەوە. هەردەم ڕێزی لە بیر و بۆچوونی کەسانی تر دەگرت، بەڵام هەرگیز هەستی بە پێویستیی وەرگرتنی ئامۆژگاریی نەکردبوو لە کەس. بابەتە هەرە سەختەکانی بەوپەڕی ئاسانی شیکار دەکرد و، بە چرکەیەك خەڵکانی لە بێئاگایی و گومڕاییەوە سەردەخست بۆ شەرەف و فەزیلەت. لە وتەکانیدا ژیری و دانایی هاوشانی یەك بوون و، ئەوپەڕی دامەزراوی دەنواند لەسەر ئەو شتانەی کە بەلایەوە ڕاست و جوان بوون. ئەوەندە تەقواکار بوو، فریشتەکان حەسوودییان بە ڕوونی و سافی هەڵسوکەوتەکانی و، نەرمی و پاراوی جموجوڵەکانی دەبرد. خۆبەگەورەزانین و لووتبەرزی، شتانێك بوون هەرگیز بۆ تەنها جارێکیش نەیانتوانیبوو لە هەرێمی سووتێنەر و توێنەرەوەی ئەودا دەربکەون. وەڵامی ئەو تۆمەتانەی نەدەدایەوە کە دەدرانە پاڵ شەخسی

خۆی و ئارامی دەگرت و، خۆی زۆر دەپاراست لە تاوانبارکردنی کەسانی تر. ترسنۆکیی نەیتوانیبوو توخنی گەڕەکی ئەو بکەوێت و، وەسوەسە و گومانی نەدەناسی. هەروەك بەرامبەر گەل و هۆزەکەی دووچاری بەزین نەهات، بەهەمان جۆر کاتێکیش نۆرەی ئەوە هات لەگەڵ هەموو دنیا بکەوێتە زۆرانەوە، وەك پۆڵا خۆڕاگر بوو. ژوور و جلوبەرگ و پێخەف و خۆراکەکەی سادە و هەژارانە بوو. وە ئەو لە یەکێك لە تاکەکانی کۆمەڵگەکەی دەچوو. لە دۆستایەتیدا ئەوەندە دامەزراو و ڕاستڕەو بوو کەس پێی نەدەگەیشتەوە. لە وەفاشدا هێندە جوامێر بوو هەموانی منەتبار دەکرد...

ئەو سەرفراز بوو بەم تایبەتمەندییانە و خاوەنی فەزیلەت بوو. بە ئەندازەی فەزیلەتەکەشی بەختەوەر و ئاسوودە بوو.

بۆ ئەوەی ببین بە خاوەنی ویژدانێك کە وەك ویژدانی ئەو پاك و ڕوون بێت، پێویستە لەم شتانەدا کە بە بنچینەکانی فەزیەلەت ئەژمار دەکرێن، ئەو بە نموونە وەربگرین و، نەهێڵین ئەم تایبەتمەندییانەی کە وەك ئاوێنەیەك ڕەنگی ڕۆحمان دەدەنەوە، لەکەیان لێ بنیشێت.

بەڵێ، دەستخستنی کۆی ئەم خەسڵەتانە دەمانکات بە خاوەنی فەزیلەت و، ئەمەش دەرگای بەختەوەریی ڕاستەقینەمان بۆ دەکاتەوە. ئەگینا بەپێچەوانەوە هەر کەموکورتییەك لەم خاسیەتانەدا، وەك کونێك وایە لە دنیای فەزیلەتماندا و، ئنجا دەشبێت بە هۆکارێك بۆ لێڵ بوونی بەختەوەریمان. هەروەك تاکە چارەسەری پاراستنی ئاوی پاك ئەوەیە کە لە شتە پیس و بۆگەنەکان بپارێزرێت، بەهەمان جۆر ئاسوودەیی و بەختەوەریش بەوە دەبێت کە بۆ چرکەساتێکیش بێ فەزیلەت و بە تەنها جێی نەهێڵین.

# خۆشەویستیی

خۆشەویستیی، ڕەگداکوتاوترین ماکە لە هەموو بەدیهاتوویەکدا کاتێك دێتە دنیا و، ڕووناکترین نوور و، گەورەترین هێزە. هیچ دوژمنێکیش نییە لەسەر زەویدا ئەم هێزە نەتوانێت بیبەزێنێت. ئەگەر سەرەتا خۆشەویستی تێکەڵاوی هەر دڵێك ببێت بەرزی دەکاتەوە و ئامادەی دەکات بۆ جیهانە نەبینراوەکان. پاشان ئەم دڵانە دەکەونە خەمی ئەوەی هەرچییەکیان لە ئەبەدییەت بیستووە و وەرگرتووە بگەیەنن بە هەموو سنگەکان. ئیتر لەم ڕێیەدا دەمرن و دەژیەنەوە، کە دەمرن ناوی "خۆشەویستی" لەسەر زمانیانە و، کاتێکیش زیندوو دەبنەوە، بە هەناسەکانی ئەو دەبووژێنەوە.

سەبارەت بەو دڵانەی کە خۆشەویستییان نییە،کامڵ بوون و بەرزبوونەوە بەرەو ئاسمانەکانی مرۆڤایەتی کارێکی ئەستەمە. بەڵێ، ئەگەر ئەوان سەدانساڵیش بژین، هێشتا بەقەدەر دەنکە گەنمێك ڕێگای کامڵی نابڕن. ئەم سینانەی کە بێبەشن لە خۆشەویستی، چونکە لە کۆڵانە تاریکەکانی خود ڕزگاریان نەبووە، ناتوانن کەسیان خۆشبوێت و، هەست

بە خۆشەویستی ناکەن و، بێ ئاگا لەو خۆشەویستییەی کە لە سینەی گەردووندا لێ دەدات، دەمرن و لەناو دەچن.

کاتێك منداڵ بۆ یەکەم جار چاوی دەکاتەوە ڕووبەڕووی خۆشەویستی دەبێتەوە و، ڕۆحە میهرەبانەکان دەبینێت و، پاڵ دەدات بەو دڵانەوە کە بە خۆشەویستی لێ دەدەن و، بەم شێوەیە گەورە دەبێت. دواتر جاری وا هەیە ئەم خۆشەویستییە دەدۆزێتەوە، یاخود دەستی ناکەوێت. بەڵام بەدرێژایی تەمەنێك هەر بەدوای ئەو خۆشەویستییەدا دەگەڕێت و بە شوێنیدا ڕادەکات.

لە ڕوخساری خۆردا شوێنەواری خۆشەویستی هەیە. ئاوەکان دەبن بە هەڵم و بەرەو ئەو خۆشەویستییە بەرزدەبنەوە، نمە ئاوەکان لەسەرەوە یەکدەگرن و دەبن بە دڵۆپ، باڵ دەگرن بەو خۆشەویستییە و، بەدەم هاوارکردنەوە دادەبارن بەسەر سنگی خاکدا. گوڵ و گیا بە خۆشەویستی شکۆفە دەکەن و بەدەم ڕێبوارانەوە پێدەکەنن. ژاڵەکان لەسەر تەختی گەڵاکان خێوەت هەڵدەدەن، هەمیشە نیگای پڕ لە خۆشەویستی دەگرنە چواردەوریان و سەما دەکەن. کار و بەرخ بە خۆشەویستی دەباعێنن و، باڵندە و بێچووەکان بە خۆشەویستی دەجریوێنن و، کۆرسی خۆشەویستی پێکدەهێنن.

هەموو بەدیهاتوویەك بەگوێرەی پێگەکەی، بە ویستی خۆی یان بێ ویستی خۆی، بەشداری دەکات لەم سەمفۆنیایەدا و، تێدەکۆشێت ئەو عەشق و خۆشەویستییە قووڵە دەربخات کە لە سنگی بووندایە.

خۆشەویستیی لە ڕۆحی مرۆڤدا شوێنەواری هێندە قووڵ دروست دەکات کە لەپێناویدا خانە و نیشتمان بەجێدەهێڵرێت، ئەگەر پێویست بکات ماڵەکان چۆڵ دەکرێن و، لە گشت دۆڵێکدا مەجنونێك دەناڵێنێت و هاواری لەیلایەك دەکات. ئەو دڵە کرچ و کاڵانەش کە لە خۆشەویستی ناخیان نەگەیشتوون، ئەم کارە ناو دەنێن "شێتی"..!

خەمخۆری و ژیان لەپێناو کەسانی تردا خاسیەتێکی مرۆییە و سەرچاوەکەشی خۆشەویستییە. ئەوانەی کە لەناو مرۆڤەکاندا زۆرترین بەشیان لەم خۆشەویستییە بەردەکەوێت، مەزنترینی پاڵەوانەکانن. ئەو پاڵەوانە مەزنانەی کە سەرکەوتوو بوون لە هەڵکەندن و فڕێدانی ڕق و نەفرەتی ناخیان... مەرگ ناتوانێت هەناسەی ئەم پاڵەوانانە کۆتایی پێ بهێنێت. خەزانیش ناتوانێت گوڵی ئەوان سیس بکات. لەڕاستیدا ئەم ڕۆحە سەرنجڕاکێشانەی کە هەموو ڕۆژێك لە دنیای ناوەوەیاندا مەشخەڵێکی نوێی خۆشەویستی گڕ دەدەن و، دڵیان دەکەن بە پێخەفی عەشق و سەودا و، لە جیهانی هەستەکانیاندا چەندین تونێل و گوزەر لێ دەدەن بۆ دڵی کەسانی تر و دەزانن چۆن پێیان بگەن. ئەمانە لە دیوانێکی هێندە مەزن مافی ژیانی هەتاهەتاییان بەدەست هێناوە کە نەك هەر مەرگ و فەنا، بەڵکو تەنانەت قیامەتەکانیش ناتوانن گوڵی ئەوان بژاکێنن و پێکی ئەوان بشکێنن.

ئەو دایکەی کە قارەمانی شەفەقەتە و ئامادەیە لەپێناوی جگەرگۆشەکەیدا ژیانی خۆی بەخت بکات، ئەو فیداکارەی کە لەبەر خاتری وڵات و کۆمەڵگەکەی ژیانی خۆی بە سووک سەیر دەکات،

ئەو قارەمانەش کە لەپێناوی مرۆڤایەتیدا دەژی و دەمرێ، نموونەیەکی باڵای نەمرییە کە لەسەر تەختی دڵان دادەنیشێت. لە دەستی کەسانی لەم جۆرەدا، خۆشەویستی چەکێکە هەموو دوژمنێك دەبەزێنێت و، کلیلێکی ئەفسووناوییە دەتوانێت هەموو دەرگایەك بکاتەوە. ئەوانەی کە خاوەنی ئەم چەك و کلیلەن، ئەمرۆش نەبێت بێگومان سبەینێ، هەموو دەرگاکانی جیهان دەکەنەوە و، بە خۆیان و بوغوردانی خۆشەویستییە دەستیانەوە، بۆنی ئاسوودەیی بە هەموو لایەکدا بڵاودەکەنەوە.

ڕێگای خۆشەویستی کورتترین ڕێیە بۆ کردنەوەی دڵەکان. وە ڕێگای خۆشەویستی ڕێی پێغەمبەرانە. ئەوانەی کە لەسەر ئەم ڕێگایەن هەرگیز دەرگاکان بەڕوویاندا داناخرێت! ئەگەر دانەیەکیش دابخرێت، لەبری ئەوە سەدان و هەزارانیان بۆ دەکرێتەوە. ئەگەر یەك جار لە ڕێگەی خۆشەویستییەوە دڵێك بکرێتەوە، ئیدی هیچ کێشەیەکی تر لە ئارادا نامێنێت.

خۆشحاڵی بۆ ئەوانەی کە خۆشەویستییان کردووە بە ڕابەر! بەدبەختی بۆ ئەو چارەڕەشەی کە تامی خۆشەویستی ناخی ناکات و تەمەنێك بە کوێری و کەڕی دەژی!

ئەی خوای گەورە! لەم ڕۆژگارەدا کە ڕق و قین وەك تاریکەشەو هەموو لایەکیان داگیر کردووە، پەنا بە خۆشەویستی تۆ دەگرین، بۆ دوایین جار لە دەرگانەتدا دەکڕوزێینەوە و داوات لێ دەکەین دڵی ئەم بەندە هەڵەشە و لەسنووردەرچووانەت پڕ بکەیت لە هەستی مرۆڤانە و خۆشەویستی!

# مرۆڤی نوێ

وا خەریکە دەچینە ناو سەدەیەکی نوێوە کە کراوەیە بەڕووی درەوشانەوەی عینایەتی خوای گەورەدا. مێژووش خۆی دووبارە دەکاتەوە. سەبارەت بە دنیای ئێمە سەدەی هەژدەهەم چەرخی ئەو چاولێکەرە کاڵفامانە بوو کە لە خۆیان دوور کەوتنەوە. سەدەی نۆزدەهەمیش سەردەمی ئەوانەبوو کە دژایەتی مێژوو و دینامیکەکانی خۆیان کرد و کەوتنە باوەشی کۆمەڵێك فەنتازیاوە. سەدەی بیستەمیش چەرخی ئەوانەبوو کە بە تەواوەتی نامۆ بوون لە خۆیان و، کەوتنە ئینکار کردنی بوونی خۆیان و، هەربۆیە لە دەرەوەی خۆیان بەدوای ڕووناکی و پێشەوادا دەگەڕان. پشت بەستوو بە هەموو ئەو نیشانانەی کە لە گشت لایەکەوە دەرکەوتوون، سەدەی بیست و یەکەم چاخی باوەڕ و باوەڕداران دەبێت و، دەبێت بە ڕێنیسانسی[1] ئێمە.

---

١. ڕێنیسانس وشەیەکی فەڕەنسییە و بە واتای "سەرلەنوێ لە دایك بوونەوە" دێت. وەك ناوێك لەو سەردەمەی ئەوروپا نرا کە شۆڕشی فیکری توانی چاخە تاریکەکانی سەدەکانی ناوەڕاست کۆتایی پێ بهێنێت و پاشانیش شۆڕشی پیشەسازی بەدوای خۆیدا هێنا.

بەڵێ، لەناو بێ عەقڵ و ساویلکەکان و ئەوانەی کە بەدەم خەوەوە دەڕۆن و لە جیهانی فەنتازیادا دەژین، مرۆڤێکی تازە و نوێ لەدایك دەبێت کە بیردەکاتەوە و هەڵدەسەنگێنێت و، بە ئەندازەی ژیری گرنگی بە ئەزموون دەدات و، بەقەدەر ئەزموونیش ڕێز لە ژیری دەگرێت و، بە ئەندازەی ئەم دووانەش باوەڕی بە ئیلهام و ویژدان هەیە و متمانەی پێیەتی... مرۆڤێکی نوێی وا کە بە هەموو لایەنێکی بەدوی کامڵیدا وێڵە و، گشتگیرە و، هاوسەنگی نێوان دنیا و ئەودنیای ڕاگرتووە و، سەرکەوتوو بووە لە هاوسەرگیری نێوان دڵ و ژیریدا. بێگومان لەدایکبوونی ئەم مرۆڤە نوێیە زۆر ئاسان نابێت. وەك هەر لەدایکبوونێکی تر ئازار و ژان و هەژانی تایبەت بە خۆی دەبێت. بەڵام کاتێك وەرزی خۆی هات، بێگومان ئەم لەدایکبوونە پیرۆزە دێتە دی و ئەم نەوە ڕوخسار درەخشانە لەپڕێکدا لەناوماندا دەردەکەوێت. وەك بارینی ڕەحمەت لە هەورە چڕ و ئەستوورەکانەوە و، هەڵقوڵانی ئاو لە ناخی زەوییەوە و، توانەوەی شەختە سەهۆڵەکان و دەرکەوتنی نۆبەرەی گوڵانی بەهار و، دانیشتنی شەونم لەسەر تەختی گەڵا... ئەم مرۆڤە نوێیەش ئەمڕۆ یان سبەی، بەڵام بێگومان هەر دێت..

مرۆڤی نوێ کەسایەتییەکی وایە کە لە هەموو کاریگەرییە دەرەکییەکان ڕزگاری بووە و لەسەر پێی خۆی ڕاوەستاوە. هەروەك ڕۆژهەڵات-ڕۆژئاوا ناتوانێت زنجیر لە دەستی بکات و بەدیل بیگرێت، بەهەمان جۆر ئەو "یزم"انەش کە یەکناگرنەوە لەگەڵ جیهانی مانای ئەودا، ناتوانن ڕێگا و ئاڕاستەی پێ بگۆڕن و تەنانەت ناشتوانن لە شوێنی خۆی بیجووڵێنن. بەڵێ، ئەو بیرکردنەوەی ئازاد و ئیرادەی ئازاد

و خەیاڵەکانی ئازادن و، ئازادییەکەشی بەئەندازەی بەندایەتییەتی بۆ خوای گەورە. هەوڵ دەدات لە خۆی و لە پاڵنەرە مێژووییەکانی خۆی بچێت، نەك لە خەڵکانی تر بچێت و لاسایی کەسانی تر بکاتەوە.

مرۆڤی نوێ، کەسێکە بیردەکاتەوە و لێکۆڵەرە و باوەڕدارە و کراوەیە بەڕووی ڕۆحانییەتدا و سەرشارە بە چێژە ڕۆحییەکان. ئەو، بە مەبەستی دامەزراندنی دنیاکەی سوودی تەواو لە ئامرازەکانی سەردەمەکەی وەردەگرێت و، لەپاڵ ئەمەشدا خاوەنی بەها نەتەوەیی و مەعنەوییەکانی خۆی دەبێت و، توانا و وزەیەکی زۆر جیاواز دەخاتە مەیدان.

وەك باوەڕدارانی ڕابردووە شکۆدارەکەی باوەڕ دەهێنێت و، وەك ئەوان بیر دەکاتەوە و، وەك ئەوان تێدەکۆشێت بۆ گەیاندنی پەیامە ژیانبەخشەکەی و، وەك ئەوان لە سینەی تاریکیدا تۆوی ڕووناکی دەچێنێت.. کاتێکیش ئەمانە دەکات وەفایەکی قووڵی هەیە و هەرگیز بۆ ساتێکیش لە حەق لانادات.. لەپێناو سەرخستنی حەقدا هەموو ڕۆژێك چەند جارێك دەمرێت و دەژییتەوە.. ئەگەر پێویست بکات ئامادەیە خانە و نیشتمان و ماڵ و منداڵ بەجێبهێڵێت. بێ ئەوەی ترسی گیان و ماڵی هەبێت و ئارەزووی پاڵدانەوە و پشوودان زاڵ بێت بەسەریدا، لەپێناو ئایندەی نزیك و دووری نەتەوەکەیدا، هەرچی هەیەتی و بێ ئەوەی گەردیلەیەکی بەفیڕۆ بدات، وەك تۆو لە بناری عینایەتی خوادا دەیانوەشێنێت. پاشان وەك چۆن مریشك جووجەڵەکانی لەژێر باڵیدا دەپارێزێت، دەچێتە دۆخی چاوەڕوانی و ڕەنج کێشانەوە، دەناڵێنێت و دەپاڕێتەوە. ڕۆیشتن لەسەر ڕێگای حەق و، مردن لەو ڕێیەدا بە

ئامانجی ژیانی دەزانێت و لەدەست دانی ئەم ئامانجەش بە گەورەترین زیان ئەژمار دەکات کە قەرەبوو ناکرێتەوە...

مرۆڤی نوێ، لەپێناو گەیشتن بە ژیری و دڵ و ڕۆح و هەستی مرۆڤەکانی تر، هەر لە کتێبەوە تا ڕۆژنامە و، هەر لە گۆڤارەوە تا ڕادیۆ و تەلەفزیۆن، بەکاردەهێنێت و سوودیان لێ وەردەگرێت و، تێدەکۆشێت جارێکی تر خۆی بسەلمێنێت.. نەك تەنها خۆی دەسەلمێنێت، بەڵکو ئەو شوێن و پێگەیەی کە لێی داگیر کراوە لەسەر ئاستی هاوسەنگیی وڵاتان، وەریدەگرێتەوە...

مرۆڤی نوێ، ڕەگەکانی ڕۆحی زۆر قووڵ و ئەو دنیایەش کە تیایدا دەژی فرەڕەهەندە. ئەو هەر لە زانستەوە تا هونەر، هەر لە تەکنەلۆجیاوە هەتا مێتافیزیك، لە هەموو بوارێکدا خاوەنی قسەیە و، ئاگاداری هەموو ئەو بابەتانەیە کە پەیوەندییان پێوەی هەیە. بەڵێ، ئەو بە عەشقێك بۆ زانست کە تێربوونی نییە و، بە هۆگرییەك بۆ مەعریفەت کە هەموو ڕۆژێك لە هەڵکشاندایە و، بە فراوانییەکی لەددوننی کە لەسەروو ئاستی تێگەیشتنەوەیە، هاوشان لەگەڵ مرۆڤە ڕووناکەکانی چەرخی ڕۆشنایی، هەموو ڕۆژێك وەك ئەوەی لە میعراجێکدا بێت، شان بەشانی ڕۆحانییەکان ئەسپ تاو دەدات.

مرۆڤی نوێ، پڕە لە خۆشەویستی بۆ هەموو بوون و پارێزەری بەها مرۆییەکانە. ئەو لە لایەك خاوەنی ڕەوشت و فەزیلەت و هەموو ئەو تایبەتمەندییانەیە کە مرۆڤ دەکەن بە مرۆڤی ڕاستەقینە و، لە لایەکی تریشەوە هێندە جیهانییە کە هەموو بوون بە میهرەبانییەوە باوەش

دەکات. هەروەك بوون و خاسیەتەکانی خۆی هەڵدەبژێرێت، لە هەمان کاتدا بوونەوەر و مرۆڤەکانی چواردەوریشی بەو شێوەیەی کە پێویستە ببن، ڕێك دەخات. چەندەش دەرفەتی بۆ هەڵبکەوێت هەوڵ دەدات ئەم پڕۆژانەی جێبەجێ بکات. ئەو، هەموو شتێکی باش و جوانی دەوروبەری خۆی دەپارێزێت، ئەمەش دەدات بە گوێی ئەوانی تریشدا.. بەرامبەر هەموو خراپەکان جەنگ ڕادەگەیەنێت و تا ئەو کاتەی لە کۆمەڵگەکەیدا بنەبڕی دەکات، وەك تیری ڕاکێشراو لە ئامادەباشیدایە. باوەڕداره و ئامۆژگاری هەموانیش دەکات بۆ باوەڕ هێنان.. بە پەرستش دەڵێت "جوان" و دەبێت بە زمانی گۆیای ئەو. ئەو کتێبانەی پێویستە بخوێنرێنەوە، ئەو دەیانخوێنێتەوە و هانی کەسانی تریش دەدات بۆ خوێندنەوەیان. شان دەداتە بەر ئەو ڕۆژنامە و گۆڤارانەی کە ڕێز لە ڕەگەکانی مانا و ڕۆح دەگرن.. کۆڵان بە کۆڵان دەگەڕێ، وەك خزمەتگوزارێك بەدەم هەموو پێداویستییەکی کۆمەڵگەکەیەوە دەڕوات.. ئەو بەم حاڵەی دەبێت بە ڕەمزی لێپرساوێتی و کارگوزاری.

مرۆڤی نوێ، خاوەنی ڕۆحی بنیاتنانە و دژی هەموو جۆرە قەتیس بوونێکە. دەزانێت چۆن خۆی نوێ بکاتەوە و ڕووداوەکان ڕام بکات. وە هەمیشە لە پێش ئەو چەرخەوە دەڕوات کە تیایدا دەژی. دەڕوات، بە کۆششێك کە لەودیو سنوورەکانی ئیرادەوەیە، بە شەوقەوە و پشت بەستوو بە خوا. لە ژیانی ئەودا ڕەچاوکردنی هۆکارەکان و تەوەککول هێندە لەناو یەکدان، کەسانی نەزان لەوانەیە وابزانن هۆکارپەرست یاخود جەبرییە. کەچی ئەو نە ئەمیانە و نە ئەویان، مرۆڤی نوێ کەسێکی تەواو هاوسەنگە.. ڕەچاو کردنی هۆکارەکان بە ئەرك دەزانێت و، تەسلیم

بوونیش بە خوای گەورە بە داخوازی ئیمان هەژمار دەکات.

مرۆڤی نوێ دۆزەرەوە و هەڵمەتبەرە. هەموو ڕۆژێك لە قووڵایی بوونیدا و لە فراوانی فەزادا، ئاڵای خۆی بەسەر قەڵای نوێوە هەڵدەواسێت و، دەرگا نهێنییەکانی ئاسۆ و دەروونەکان دەکاتەوە. چەند لەسایەی ئیمان و مەعریفەتدا بگات بە ئەودیو پەردەی بوونەوەران، ئەوەندە زیاتر باڵەکانی دەکرێنەوە.. لە دوورتر و پاشان لە دوورتر دەنیشێتەوە.. تا ڕۆژێك دێت "خاك" بەو شتانەی لە سینەیدا شاردوویەتیەوە بانگی دەکات، گەوهەری قووڵایی دەریاکان بە عەسا ئەفسووناوییەکەی ئەو دێنە دەر.. ئاسمانەکان دەرگاکانیان دەخەنە سەر پشت و پێی دەڵێن "فەرموو!"

# چەند ئامۆژگارییەک

هاوڕێ! هەتا لە ژیاندایت دەرگای هەست و بیرکردنەوە و دڵت بەڕووی هەموو جۆرەکانی خراپەدا دابخە! هەمیشە لە سنووری ڕەزامەندی خوادا بەدوای باشترین و جوانترین و ڕاسترینەدا بگەڕێ! سەرجەم قین و نەفرەت و ڕقەکان بە زللەیەك فڕێدە ئەودیو چیای قاف و، سنگت بۆ خۆشەویستی و مرۆڤایەتی و چاکەکاری بخە سەر پشت! ڕاکە بەدەم یارمەتی ئەوانەوە کە داوای یارمەتی دەکەن، ئازار و ژانی بیماران و بێنەوایان تیمار کە!

خۆت تەرخان بکە بۆ شەڕکردن لەدژی ئەو تاریکییانەی کە چەندین ساڵە سەر زەوییان تەنیوە و، خۆت یەکلایی بکەرەوە بۆ ڕەواندنەوەی خاڵە تاریکەکان بە مەشخەڵی زانست و عیرفان! وە هەتا تەمەن ماوەت دەدات بۆ ساتێکیش لە بەرەنگاربوونەوەی ئینکار و ئیلحاد و نەزانی دوا مەکەوە!

لەژێر ئەو ڕووناکییانەدا ڕێ بکە کە خوای گەورە ناردوونی، پێش و دوا و، ڕاست و چەپ و، ڕۆح و دڵت بەمانە ڕۆشن بکەرەوە! بزانە ئەگەر ویژدان و مێشکت لە زانستی حەقیقەت و، دڵیشت لە ڕووناکی ئیمان بێبەش بێت، ناتوانیت لە بیرکردنەوە خراپەکان دەربازت ببێت و، ئەو ڕێگایانەش نادۆزیتەوە کە دەگەن بە مرۆڤایەتی و خۆشەویستی و بەها باڵاکان...

هەرگیز لە ڕاستی و ڕێگای ڕاست و فەزیلەت لا مەدە، ئەگەر چی تاڵیش بێت! ئەو کاروانانەی کە بەرەو خۆشەویستی خوا و خزمەت کردنی مرۆڤەکان ڕێیان گرتووەتە بەر، هەمیشە لەم وێستگانەوە بەڕێ کەوتوون و، بە گرتنەبەری ئەم گوزەرگایە بەردەوامییان بە گەشتەکەیان داوە.

کەمتەرخەمی مەنوێنە لە خۆشویستن و بەزەیی هاتنەوە بە بچووکەکان و ڕێزگرتنی گەورەکاندا! ئاگاداری هەموو ئەو بەها و پەیوەندییانە بە کە تاکەکانی نەتەوە بەیەکەوە دەبەستێتەوە، وەك یەکێتیی دین و، یەکێتیی نیشتمان و، یەکێتیی ئامانج.. بزانە چۆن ڕووبەڕووی هەموو ئەو نامۆبوون و دژیەکی و لاساییە کوێرانەیە دەوەستیتەوە کە دژی ڕۆحی نەتەوەن و، ساتێکیش دوا مەکەوە لە پاراستنی خود و ناوەڕۆکی خۆت!

باوەڕ بە پیرۆزی کار و کۆشش بکە، هەرگیز نەکەیت بکەویتە گومانی ئەوەی کە خەڵکانی تر ناچارن بەخێوت بکەن و ژیانت دابین بکەن! بزانە کە تۆ لێپرسراویت لە خزمەت کردنی مرۆڤایەتی، نەك مرۆڤایەتی لێپرسراو بێت لە خزمەت کردنی تۆ. بزانە و باوەڕت هەبێت

کە تەنها ئەگەر "منێتی"یت لە ئاگری پاکژکەرەوەی فیداکاریدا بسووتێت و ببێت بە خۆڵەمێش، ئەوسا بە کەڵکی شتێك دێت و نرخێکی دەبێت!

بزانە و دڵنیابە کە هاتنەدی هیوا گەورەکانت و گەیشتن بە بەختەوەری، بەئەندازەی ڕام بوونت بۆ ئیرادەی خوایی، دەستت لێیان گیر دەبێت و، لەبری هێز و توانا و ویستی خۆت، پەنا بۆ توانستی ڕەهای ئەو ببە!

هەردەم بە هەڵەداوان ڕاکە بەرەو هەرێمی گەرموگوڕی عەشق و خۆشەویستی و وەفا، بەتەواوی متمانە بە کاریگەریی نەرمکەرەوەی ئەوان بکە! وە هەرگیز لە یادت نەچێت کە بەم کلیلە ئەفسووناوییانەی کە بەدیهێنەر لە ناخی تۆدا دایناوە، تەنانەت ژەنگاویترین قفڵەکانیش دەکرێنەوە!

# سروشتی شێوێنراو

سەرتاپای سروشت وەك پێشانگایەکی شتە سەرسوورِهێنەرەکان وایە، بەڵام ئێمە لەبری "پێشانگا"، زیاتر پێمان باشە پێی بوترێت 'کتێب'. چونکە ئێمە وەك کتێبێك دەیخوێنینەوە و، هەستی پێ دەکەین و، بە چەشنی ڕوانین بۆ نەخشە ڕەنگاوڕەنگ و زیندوو و زاخاو دراوەکانی کتێبێك، تەماشای دەکەین و لێی ورد دەبینەوە. هەموو بەیانییەك بە بەژن و باڵای ڕازاوە و بریقەدار و سەسوورِهێنەریەوە و، وەك سەرچاوەی ژیان و گیان لە بەردەمماندا دەیبینین و سەرمەست دەبین.

بەتایبەت ئەو کاتانەی کە ئەم پێشانگا و ئەم کتێبە هێندە سەرسوورِهێنەر بوو کە لە خەونەکاندا جێی نەدەبووە و، وەك داوێك وابوو بۆ ڕاوکردنی خولیا و خەیاڵەکان و، کەشتییەکی مەزن بوو کە چارۆکەکانی بەڕووی عەشق و خۆشەویستیدا واڵا کردبوو و، چەشنی ئاوێزەیەك کە هەزار و یەك چرای لەناودا بێت، بە پەنجە نوورانییەکانی ئاماژەی بۆ جیهانەکانی ئەودیو دەکرد. تەپۆڵکە زومرِوتییەکانی، دۆڵە

فێنکەکانی، دارستانەکانی کە هەزاران زیندەوەر تێیدا دەسلەملانی یەکترن و گەمە لەگەڵ یەکدی دەکەن، ئەو باخ و بێستانانەی کە باخچەکانی بەهەشت یادی مرۆڤ دەخەنەوە، جریوە جریوی باڵندەکانی، خشەی پێی مێرووەکانی، ئەو بەرەکەت و میهرەبانییەی کە لە ئاسمانەوە دەبارێت، وە لە بەرامبەر ئەم بەرەکەت و میهرەبانییەدا، بە هەڵقوڵانی سوپاس و ستایش لە سینە پاکەکانی سەر ڕووی زەوی و بەرزبوونەوەی بەرەو ئاسمانەکان، لایەنێکی جیهانی دوارۆژی بەرجەستە دەکرد...

بەڵێ، ئەو دڵانەی کە بەم شێوەیە هەست بە سروشت دەکەن، وەك ئەوەی هۆگری هەموو ئەو دەنگ و نەغمە و ڕەنگ و تام و بۆن و جوانییانە بن کە دەستی قودرەت لە سنگی سروشتەوە هەڵیاندەقوڵێنێت، نەیاندەتوانی خۆیان بگرن و هەموو ئەمانە نەبینن و، تامی نەکەن و، دەردەدڵیان لەگەڵدا ساز نەکەن و لەگەڵیان نەکەونە گفتوگۆ. چونکە ئەوەندە لەگەڵیان تێکەڵاو بووبوون، وەك چۆن لە بەرامبەر خواردنە خۆش و بەتامەکاندا لیکەڕژێنەکانمان دەکەونە جووڵە، وەك چۆن کاتێك نەی دەبینین بێ ویستی خۆمان شتێك لە بەردەم خۆمانەوە دەڵێین... بە هەمان جۆر، ئەو ڕۆحە پاکانەش کە بە تێڕامان لە سروشت سەرمەست بوون، لە هەر نیگایەکدا، هەست بە شتانی جیاواز دەکەن لەمەڕ جیهانی ئەودیو و دەهەژێن.

هەروەك چۆن کۆشکێك و میوانخانەیەك جگە لە دەرخستنی ئەو جوانی و وردی و ناسکییەی کە تیایدایە، لە پشتی ئەو کۆشك و میوانخانەیەوە شتانێك بە گوێماندا دەچپێنێت سەبارەت بە بەدیهێنەرەکەی، بەهەمان جۆر

ئەم پێشانگای سروشتەی کە بەرهەمێکی هونەریی سەرسووڕهێنەرە، لە پشتی ئەم بوونەوەرانەوە پیشانمان دەدات کە: کەسێك هەیە بەدیدەهێنێت و بوونی پێ دەبەخشێت، ڕێکوپێکی دەکات و یاسا و ڕێسای بۆ دیاری دەکات، لە هەر سنعەتێکدا کە خستوویەتیە ڕوو خۆی دەناسێنێت، بەڵام لەبەر مەزنییە ڕەهاکەی بەتەواوەتی پەی پێ نابرێت و سەرچاوەی ڕاستەقینەی هەموو جۆرەکانی ڕێسا و جوانییە. بەڵێ، ئەمە بە گوێی ویژدانەکاندا دەدات و مەستیان دەکات.

ئەندازیاریی لە سروشتدا دەستلەملانی ئاسمانەکان بووە. دەرکەوتنی شاخە بەسام و شکۆکان وەك ئەوەی کە سەریان خستبێتە سەر کۆشی ئاسمان و، وێنەی ئاسمانەکانیش وەك بڵێی خۆیان ڕادەستی ئەم ئارەزووی ویساڵە گەرموگوڕ و بەهێزە کردبێت.. بەڵێ، ئەم ئەندازیارییە ئاماژە و نیشانەیەکی چەند شیرینە! خەیاڵی مرۆڤ، بە چەشنی نیشتنەوە و فڕینی هەنگەکان لەم گوڵ بۆ ئەو گوڵ، بە گەڕان بەسەر درەوشانەوە جوانەکانی سروشتدا هەتا ئاسۆ دەفڕێت... کاتێکیش دەگات بەوێ، دیسان دەست بە گەشتێکی نوێ دەکات و، دەبینێت ڕێگاکان بەرەو ڕەهایی ئەودیو ئاسمانەکان درێژ دەبنەوە. هەر بۆیە لە قووڵایی ڕۆحیدا هەست بە مۆسیقای ئەمری دەکات. ئەوانەی کە توانیویانە ماوەیەکی دوور و درێژ بە خۆیان و خولیاکانیانەوە لەم جیهانەدا بمێننەوە، شاد دەبن بەو خۆشەویستە ڕاستەقینەیەی کە بە سەودای ئەو ئاگریان گرتووە و هەست بە حەسرەتی جوودایی دەکەن لە ویژدانیاندا. وە هەرگیز حەز ناکەن لەم خەونە شیرینە بێدار ببنەوە...

ئەوانەی کە لە دڵ و ڕۆح و ویژدانیاندا هەزار و یەك تام و چێژ خورەی دێت و بڕیاریان داوە یەکێك بن لە ڕێبوارانی ئەم کاروانی عیرفانە، سروشت بە خۆی و دیمەنە خەمرەوێن و، تەپۆڵکە ڕەنگاوڕەنگ و، چیا مەست و، باخچە خومار و، ڕووبارە بەخورەکانی، هەموو تێکڕا و پێکەوە سروودی "یەکتایی، یەکتایی" دەچڕن. بەڵێ، بەتایبەت لە وەرزی بەهار و هاویندا، سروشت پێشانگای جوانی و نیشتمانی خۆشی و کەیف و سەفایە.

هەموو لایەك و سووچێکی ئەم کتێب و پێشانگایە مەزنییەکی جیاواز و، هۆنراوەیەکی ناوازە و، ئەفسوونێکی دانسقەیە. ئەو، بەم جوانییە جۆراوجۆرانە و، بەو ڕەنگ و شکڵ و شێوە جیاجیایانەی کە چەندین ڕەهەندی جیاواز دەبەخشن بە جوانییەکانی و، بەو بەژن و باڵایەی کە سنووری خەیاڵ تێدەپەڕێنێت، وەك شاجوانێکی بێ هاوتا وایە لە پێشبڕکێی جوانیدا و، وا لە مرۆڤ دەکات بڵێت "جوانتر لەوەی کە هەیە، مەحاڵە!". ئەو ڕۆحانەی کە بێداربوونەتەوە لەم گەلەری و پێشانگایەدا، قووڵتر لە "بوون" تێدەگەن و، لە هەموو شتێکدا مۆسیقایەکی جوانیی دەبیستن... لە دیدی ئەم دڵە سەرمەستانەدا درەختەکان "هو" دەچڕن و سەما دەکەن، گوڵەکان بە زمانی تایبەتی خۆیان بەدیهێنەری مەزن ئاشکرا دەکەن و، زەمبەق و وەنەوشە و مێخەك و ژاڵە و یاسەمین و شەوبۆ و لاولاویش بە دیمەنی جوان و بۆنی خۆشیان، شتێکمان دەربارەی ئەو جوانییە نادیارە پێ دەڵێن. لێرەدا کات هێندە بە قووڵی هەستی پێ دەکرێت، وەك ئەوە وایە مرۆڤ بە یەك جار هەست بە هەموو ئەو جوانییانە بکات کە نەوەی مرۆڤ بەدرێژایی ڕۆژگار بینیویەتی و بیستوویەتی و هەستی پێیان کردووە...

بەتایبەت هەندێك شوێن کە وەرزەکانی هەرگیز گۆڕانی بەخۆوە نەدیوە و کەشوهەواکەشی دەستی خەزانی بەر نەکەوتووە، هێندە قووڵ و ئەوەندە سەرسووڕهێنەرە، وەك ئەوە وایە مرۆڤەکان لێرەدا نزیك ببنەوە لە دوایین کەنار و سنووری جوانی، کاتێکیش نزیك دەبنەوە، ئێرە و ئەودیو لەناو یەکدا و پێکەوە دەبینن. لە بنارەکانی ئێرەدا حونجەی جوانییەکانی بەهەشت دەکەن و، لە کانیاوەکانی ئێرەدا خوڕەی ڕووبارەکانی بەهەشت دەبیستن و، لە لەرینەوەی درەختەکانی ئێرەدا هەست بە شنەبای باخچەکانی فیردەوس دەکەن... بەکورتی، لە ڕوخساری هەموو جوانییەکانی ئێرەدا بۆنی جوانییە هەمیشەییەکان دەکەن و، دەیبینن و، تێدەگەن کە تەمەنی کورتی مرۆڤ بەشی هەموو ئەم جۆرە چێژانە ناکات و، هەر بۆیە بە ئارەزووی ئەبەدییەت دەخرۆشێن و، پاشان ڕوو دەکەنە ئەو خاوەن توانستە ڕەهایەی کە دەتوانێت ئەم ئارەزووە گرنگ و بەنرخە بهێنێتە دی.

ئەم کتێبە مەزن و ئەم پێشەنگا سەرسامکەرەی سروشت کە لە لایەن خاوەنی میهرەبانیی ڕەهاوە بەدیهێنراوە و بە مەبەستی حەوانەوە و خوێندنەوە و تێڕامان بە مرۆڤ بەخشراوە، بەداخەوە ئەمڕۆ بەقەدەر تۆپەڵێك خۆڵ و خاشاك گرنگی و بایەخی پێ نادرێت. نەك هەر گرنگی پێ نادرێت، بەڵکو پارچە پارچە بووە و لە هەر چوار لاوە ڕووبەڕووی دەستدرێژی و هەڵمەتی بۆگەن کردن و بە بیابان کردن بووەتەوە.

ئەو هەوایەی کە عەرشێکی مەزنی ئەمر و ئیرادەیە، ئەمڕۆ ئیدی عیفریتێکی دووکەڵاوی و گەرداوێکە شەپۆلەکانی پڕن لە ڕق. ئاویش کە سەرچاوەی ژیان و میهرەبانی خوایە، بووە بە لافاوێکی ترسناك

و جۆگەلەیەکی قیری داخراو بەڕووی ژیاندا. خاکیش کە بە وێنەی خەزنەداری بەخشین و سەخاوەتی خاوەنی میهرەبانیی ڕەها وایە، گۆڕاوە بە وڵاتی مەرگ و وشکاییەکی بێ فەڕ و، بیابانێکی بێ سەوزایی کە سیستەمی ژینگەیی تێکچووە...

وەکو هەر شتێکی تر کە بە سپاردە پێمان بەخشراوە، ستەممان لەم کتێبە بەرجەستە و لەم پێشانگا مەزنەش کرد. ستەممان کرد لەو دەشت و کۆسارانەی گۆڕیمانن بە بیابان.. ستەممان کرد لەو ڕووبار و کانیاوانەی پیسمان کردوون.. ستەممان کرد لە خاك و هەوا.. ستەممان لەو دارستان و باخ و باخچانە کرد کە هەنووکە وایان لێ هاتووە بە کەڵکی ژیان نایەن.. ڕاستترە بڵێین، بەوەی ئەم دنیا جوانەی کە هاوشێوەی بەهەشت بوو گۆڕیمان بە دۆزەخ، ستەممان لە خودی خۆمان کرد..!

ئەگەر مرۆڤەکان ئەم دنیایەی کە پیسیان کردووە و ڕێساکەیان تێکداوە، سەرلەنوێ ئاوەدانی نەکەنەوە و نەیگەیەننەوە بە جوانی و شکۆمەندییەکەی جارانی، بێ هیچ گومانێك ئەم دنیا جوانە، بەهۆی تۆفانی نوح و ڕووداوە هاوشێوەکانیەوە، وەك وێرانەیەك داروپەردووەکەی دەڕووخێت بەسەرماندا.

# ژانی پیرۆز

ئادەمیزاد ڕێبوارێکی ئاوارە و نامۆیە لەم دنیایەدا و لەپێناو دۆزینەوەی خۆی و گەیشتن بە ناوەرۆکی خۆیدا، ناچار بە گەشتێکی دوور و درێژی وا کراوە کە مەترسی زۆری تێدایە و، تەسك و تەنگەبەرە و، بەنێو چیا سەخت و ئاوە قووڵەکاندا تێدەپەڕێت. ئەو، پێویستە لەم ڕێیە درێژەدا کە نایناسێت و نایزانێت، بەرەنگاری ئاستەنگەکان ببێتەوە و، سنگ بداتە بەر ناڕەحەتییەکان و، دەربەندەکان ببڕێت و، بگات بەو ئامانجەی کە بۆی دیاریکراوە. چونکە گەشتێکی لەم جۆرە یەك جار بە نسیبی مرۆڤ دەبێت و گەیشتنی تاکیش بە نەمری، تەنها بەم گەشتە تاقانەیە بەدەست دێت.

لەڕاستیدا ئەم گەشتە تەنها تایبەت نییە بە مرۆڤەوە، بەڵکو هەموو بەدیهاتوویەك بەگوێرەی پلەکەی، لەگەڵ هاتنی بۆ جیهانی بوون، پێویستیی گەشتێکی پڕ چەرمەسەریی لەم شێوەیە لەگەڵ خۆی دەهێنێت. پاشان تا ئەو کاتەی دەگات بە پێناسی تایبەتی خۆی و، بە ناوەرۆکی

خۆیەوە دەردەکەوێت و، تەنانەت جاری وا هەیە دەگۆڕێت بە بوونێکی تر، بۆ ساتێکیش ناوەستێت و، پشوو نادات و، لەم قاڵب دەڕژێتە ئەو قاڵب و، بەردەوام لە گۆڕاندایە.. گۆڕانێکی بەئازار و ژان، هەموو ساتێك چەند جارێك دەمرێت و زیندوو دەبێتەوە...

ئاوەکان تا گەرمی نەبینن و نەبن بە هەڵم، ناگەن بە ڕوونی. تۆو هەتا نەتەقێت و نەڕزێت، ژیانی چرۆ و گوڵ نایەتە بەرهەم. ڕووبارەکان بەردەوام بەخوڕ دەڕژێن و هەمیشە دەکێشن بە تاشەبەردەکاندا، بەمەش دەپاڵێورێن و خاوێن دەبنەوە و، دەگەن بە ئاستی دڵۆپەکانی چاوی هەور.. بە بێ بەفر و باران بەهار نایەت، ئەگەر بشیەت نرخی نازانرێت. ئاڵتوون لەو نرخ و بریسکەیەی کە بەدەستی دەهێنێت و، پۆلاش لەو بەهێزی و خۆڕاگرییەدا کە خاوەنیەتی، قەرزاری ئەو مەنجەڵ و قازانانەن کە تیایاندا تواونەتەوە. خاکی ڕەق و تەق بە ئەندازەی ئەو هەورەگرمانەی کە بەسەریدا دەبارێن، دەبووژێتەوە و هەڵدەئاوسێت و دەگات بە ئاستی دایکایەتی کردن بۆ هەزار و یەك گوڵ و ڕێحانە. تاریکی لە باوەشیدا ڕووناکی گۆش دەکات و لەکۆتاییشدا بە زیانی خۆی دەشکێتەوە. زستان، هەمیشە ئامێری جۆلاکەی لەپێناو هاتنی بەهاردا دەجووڵێنێت. لەبەر ئەمەیە کە هەموو زستانێك بەهار و، هەموو شەوێك ڕۆژێکی لەدوایە. مردنەکان لەپێناو ژیانەوە و ئازارەکانیش لەبەر خاتری ژیانێکی ڕەنگاوڕەنگترن. تاك، بەدرێژایی ژیانی هەزاران جار دەمرێت و دەژیەتەوە و، بەمەش لە پەستانە تاریك و خەڵەتێنەرەکانی "من" ڕزگاری دەبێت و، دەگات بە نەمری لە ڕۆحدا. کۆمەڵیش بەو ژان و ڕەنجەی دەیکێشێت و، بەو بەربەست و ئاستەنگانەی دێنە ڕێی، کامڵ دەبێت و دەگات بە هەتاهەتایی.

ئای چەند بەچێژە مردن و ژیان لەپێناو گەیشتن بە نەمری! چەند خۆشە هەموو ڕاوەشاندن و تەکاندنێك بە ئاگادارکردنەوەیەك بزانین و، دوای هەریەکێك لەمانە خۆمان ڕابپسکێنین و بێینەوە سەر خۆمان! چ باڵەوانێتییەکە لە کاتی تێپەڕبوون بە هەزار و یەك کەندەلاّندا بێ هیوا نەبین و باوەش بکەین بە داهاتوودا!

ئەوانەی کە بە باوەڕ و شعوورەوە دەژین، لە ڕووناکی بیرکردنەوەکانیاندا بە جووتێك باڵی هیوا، دەفڕن بەسەر ئەم خانەی پڕ میحنەت و دەریا پڕ لە خوێن و زووخاوەکانی ناویدا. دەزانن بۆ پاك بوونەوە و ڕوون بوونەوە هاتوونەتە ئێرە.. دەزانن لەم ڕێیەدا وەك "نەسیمی" پێستیان دەکەنرێت و چەشنی "مەنسور" دەدرێن لە دار. چونکە قەهر و لوتف دەناسن و، لەناو نەخۆشیدا بەدوای دەرماندا دەگەڕێن. هەرچییەکیان بەسەر بێت، بەوپەڕی چێژ و سەرسامییەوە تەماشای دەکەن و هەرگیز دووچاری شڵەژان نابن. نەك هەر دووچاری نابن، بەڵکو هەموو کارەساتێکی نوێ لە سینەی ئەواندا وەك مزڕابی[1] لێ دێت کە نەغمەی نوێ دەهێنێتە مەیدان و بە جۆش و خرۆشی نوێ دەیانهەژێنێت. زریان و بۆران بۆ لوتکەی شاخەکان چی بێت، ئازار و ژانیش بۆ ئەوان هەمان شتە. تەنانەت لە ڕوویەکەوە ژیانی بێ ئازار سەبارەت بە ئەوان، مردن و ئەشکەنجەیەکی وەهایە کە ناتوانن بەرگەی بگرن. بەتایبەت ئەگەر میللەتەکەیان لە ئازاردا بتلێتەوە و بەها نەتەوەییەکان بە بەردەوامی بڕووخێنرێن!..

---

١. مزراب بەو ئامێرە بچووکە دەوترێت کە مۆزیك ژەن بە پەنجەی بەکاری دەهێنێت بۆ جوڵاندنی تاڵ و ژێیەکانی ئامێرە ژێدارەکانی مۆسیقا.

بەندە شکۆدارەکانی خوای گەورە بۆ ساتێکیش لە بەڵا و موسیبەت جودا نەبوون، ئەوانەش کە پێشی نەتەوەکانیان کەوتوون و گەیاندوویانن بە ڕووناکی بە هەمان شێوە ... ئیمامی ئەبو حەنیفە کە بە هزری تەڕ و پاراو و ڕەچەتە نایابەکانی یەکێکە لە ڕابەرە نەمرەکانی گرۆی مرۆڤ، بێ ئەدەبانە شەکەت کرا و، لە کونجی زیندان توند کرا. ئیمامی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل چەندین ساڵ وەك مرۆڤێکی تاوانبار دووچاری نزمترین و خراپترین جۆرەکانی ئەشکەنجە کرایەوە!..سەراهسی فەرهەنگە مەزنەکەی (المبسوط)ی لە بنکی ئەو بیرەدا نووسی کە تیایدا بەند کرابوو. وە چەندەها ڕەنجدەری تری وەك ئەمانە... ئەم ڕۆحە کامڵانە لەکاتێکدا ئازار و ئەشکەنجەکان ئەوانی دەگوشی، سەریان لەناو ئاسمانەکاندا بوو و، بە دڵە ڕۆشنەکانیشیان لە ڕێگای بووژانەوەی میللەتدا، هەریەکەیان دەبوون بە سەرچاوەیەکی ڕووناکی. کامپانێلا لە زینداندا و سێرڤانتێس لە دیلیدا و دۆستۆیڤسکی کاتێك لە بەدیخانەدا کاری سەختی پێ دەکرا، خۆیان دۆزییەوە و لە دڵی نەتەوەکانیاندا بە نەمری مانەوە...

هەرکەسێك بیری خزمەت کردن بە مرۆڤایەتی هەڵبگرێت، پێویستە بزانێت کە فەرمانبەرییەکەی پیرۆزە و، ڕێگاکەی درێژە و، لەم ڕێگایەشدا ڕووبەڕووی چەندین شەڕ و خراپەی جیاواز دەبێتەوە و، لە هەموو سەر سووچێکدا لووتی هەڵدەتەقێت بە لووتی مەرگدا و، وەك خوێنڕێژ و سەرسەرییەك سووکایەتی پێ دەکرێت و، تەنانەت زۆر کات مەحرووم دەکرێت لە مافە سەرەتاییەکانی ژیانی مرۆڤانە. بەڵێ، دەبێت ئەمانە بزانێت و سەری لەپێناوی ئەم کاروانە پیرۆزەدا دابنێت. ئەگینا دەگونجێت هەندێك لەو ڕۆحە کاڵ و کرچانەی کە ژان و ئازار ناناسن،

بەهۆی هەندێك ناڕەحەتی و بێبەشبوونی کەم نرخەوە، ڕێگا و ئاڕاستە بگۆڕن.

ئاخ، ڕۆحی هەژار! دەتەوێت باران ببارێت، بەڵام ئاسمان نەگرمێنێت. هەموو لایەك سەوز بنوێنێت، وەلێ هیچ تۆوێك نەپووکێتەوە. دایکان منداڵیان ببێت، بەڵام ژان نەیانگرێت... واتە دەتەوێت بازنەی فراوانی چەرخی فەلەك و ڕێسا پڕ لە داناییەکەی، بەگوێرەی ئەندازەکەی تۆ بجووڵێتەوە! نەخێر، نەخێر! تۆ نەهاتوویت بۆ ئەم جیهانە تا تەنها ڕابوێریت و لەبەر خاتری هەوا و ئارەزووەکانت بژیت. بەڵکو لەپێناو دەرکەوتنی توانا و لێهاتنە مرۆییەکانت و، چرۆ کردن و سەوز بوونی ئەو بەها بڵندانەی کە لە ماهییەتتدایە ڕەوانە کراویت و، نێرراویت تا ناخت ڕووناك ببێتەوە و ئەرکی ئاوێنەیەك بگریتە ئەستۆ لە بەرامبەر خوای گەورەدا.. هەر بۆیە جار لە دوای جار دەخرێیتە ناو مەنجەڵە گەرمەکانەوە و، فلچە زبرە بزمار ئاساکان دەتپڕووکێنن و، چەندین بار دەهەژێنرێیت و ڕادەوەشێنرێیت!

ڕێگا ئەمەیە، ڕێسا ئەمەیە، ئەوەی تری هەمووی هەوا و ئارەزوو و خەڵەتانە!

(وَلَا تَهِنُوا وَلَا تَحْزَنُوا وَأَنتُمُ الْأَعْلَوْنَ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ)

"خاو مەبنەوە و خەم مەخۆن. ئەگەر باوەڕدار بن بێگومان سەرکەوتوون!"

ئەمەیە مەڵهەم بۆ دڵەکان، هەر ئەمەیە نەفەسی ژیانبەخش!

# هێزی دوعا و پاڕانەوە

کاتێك شەوان بەو پەردە پاك و بێگەردەی هەموو بوون دادەپۆشێت، هەندێك ڕۆحی تاریك هەست بە تەنیایی و نامۆیی و دابڕانی تەواوەتی دەکەن لە هەموو شتێك. لەکاتێکدا تەنانەت لە تاریکترین کاتەکان و، تەنهاترین شوێنەکان و، چۆڵترین بیابانەکاندا، هەمیشە "ئەو" لەگەڵمانە. ئەو، هاودەمی نامۆیان و، کەسی بێکەسان و، چارەی بێچارەکانە.

تەنها ئەوە کە پەی بە دڵە شکاوەکان دەبات و، دەرمان دەنێرێت بۆ برین و زامە بەسۆکان و، تەنیایی و ترس و ئەندێشەکانمان بەو شەماڵانە دەسڕێتەوە کە لە لای ئەوەوە هەڵدەکەن. ئەو کەسەی ڕوو لە ئەو بکات، مانای وایە ڕووی لە دەرگایەك ناوە کە بێگومان دەکرێتەوە، ئەوەش کە لەو دەپاڕێتەوە، گەیشتووە بە داواکاری و پێداویستییەکانی.

ئەوانەی کە لە سیمای بەدیهێنراواندا "ئەو" دەناسن و لە ویژدانیاندا هەستی پێ دەکەن و دەیچێژن، ئیدی سەبارەت بەوان شتێکی تر نەماوەتەوە

بۆ فێربوون. پارچەکانی زانست لە مێشکی ئەوانەدا کە گەیشتوون بە مەعریفەتی ئەو، دەگۆڕێن بە کۆمەڵێك گومەزی پیرۆزەیی کە لەسەر ستوونی ئەڵماسی ڕاگیربوون. لەو ڕۆحانەشدا کە ئەو ناناسن، زانستەکان دەبن بە وەهم و، بوونیش کە بابەت و کەرەستەی زانستەکانە، دەگۆڕێت بە چەند تەرمێکی بێگیان.

لە هەرێمی ڕووناکی باوەڕهێنان بەودا سەرتاپای بوون ڕوون دەبێتەوە و، بیر و بۆچوونەکان لەمەڕ بوونەوەر و ڕووداوەکان خاوێن دەبنەوە و، هەموو شتێك بەخوڕ ڕووەو ئەو دەڕوات. ئەوانەی کە لە چوارچێوەی ئەم هەست و بیرکردنەوە پاك و بێگەردانەدا، دەزانن چۆن لەو نزیك ببنەوە و لێی بپاڕێنەوە، کامەرانترینی مرۆڤەکانن.

کاتێك ئەمەت زانی، لە دەشت یان چیا، لە شار یان چۆڵەوانی، لە شەو یان لە ڕۆژدا و، هەستت بە تەنهایی کرد، هەستە و بە هەموو بوونت ڕوو لە ئەو بکە و، دەرگاکانی دڵت بۆ ئەو بکەرەوە و، یەك یەك ئازار و ژانە بچووك و گەورەکانت و، ئارەزوو و خۆزگەکانت بۆ ئەو هەڵبڕێژە! دەبینیت ئازارەکانت نامێنن و، ناڕەحەتییەکان شوێنی خۆیان بۆ ئارامی و ئاسوودەیی جێدەهێڵن و، هەست دەکەیت هەموو سووچ و قوژبنێکی ڕۆحت شنەبای ئاوڕلێدانەوە دەیگرێتەوە.

لەوانەیە تۆ هەرگیز نەتوانیت بە پێوەرە ماددییەکان ئەو ببینیت و بیناسیت. بەڵام ئەو هەموو چرکەساتێك بە هەزار و یەك ئاماژە و نیشانە بوونی خۆی دەدات بە گوێی ویژدانتدا و، وات لێ دەکات هەست بە نزیکی ئەو بکەیت لێتەوە و، جاروباریش لێوی دڵت بە خەندە دەڕازێنێتەوە.

شەوان وەکو چەند بنارێکی کراوە وایە بەڕووی ئەم چەشنە بەرەکەتانەدا. ئەو ڕۆحانەی کە بە حەقیقەت بێداربوونەتەوە و دڵیان کردووە بە ئاوێنەیەك لە بەرامبەر درەوشانەوە ڕەنگاوڕەنگەکانی خوای گەورەدا، لەسەر بەرماڵەکانیان کەمین دادەنێن و دەچن بۆ شکاری درەوشانەوە و بریسکەکان. تۆش کاتێك بە تەنها مایتەوە، بە بنارەکانی شەودا بگەڕێ! بزانە کە ئەوێ جێژوانی یارە و، خولەکەکانیش کاتی خەڵوەتن، بە هەموو هەستت داخڵی حزووری ئەو ببە و، یەك بە یەك نهێنییەکانی دڵت بۆ ئەو باس بکە! نەخۆشییەکانت تەنها بۆ ئەو بکەرەوە، لە حزووری ئەودا بناڵێنە و، سەر بنێ سەر ئەو بەرماڵەی کە بە یەکەم هەنگاوی ڕێی گەیشتن بە ئەو دادەنرێت و، چاوەڕوان بە..! دەنگی کرانەوەی یەك بە یەکی دەرگاکانی جیهانی ناوەوەت دەبیستیت و، هەست بە توانەوە دەکەیت لەژێر ڕێژنەی ڕووناکیی بوونی ئەودا، وەك دڵۆپێك کەوتبێتە دەریایەکەوە، لە ڕووی ژمارەوە لەناودەچیت، بەڵام دواتر لە مەیدانێکدا کە سەروو ژمارەیە، تێکەڵاو دەبیت لەگەڵ شەپۆلە مەزنەکانی زەریاکاندا...

هەمیشە باڵت پێوە دەنێت بۆ قووڵتر و فراوانتر و بەرزتر. بە ئەندازەی توانای هەڵدانی چارۆکە لەم قووڵاییە یەك لەدوای یەکانەدا، خۆت وەك کەسێك دەبینیتەوە کە لە هەرێمە دەست لێنەدراو و سەرسووڕهێنەرەکانی ئەودیو و، نزارە ڕەهاکانی بەهەشتدا، سەیران بکات و بحەوێتەوە. وە لەگەڵ هەموو هەنگاوێکی نوێدا، لوتفێکی جیاوازی نزیکبوونەوە لە خوا دەبینیت.

ئەو ڕۆحانەی کە جگە لە دەرەوە هیچی تر نابینن و، ناگەن بەو مەزنی و قووڵایی و فراوانییەی کە لە ناخیاندایە، هەمیشە لە تاریکییەکاندا دەچەقن و ناتوانن لە حەسرەت و قەیرانەکان ڕزگاریان ببێت.

خۆزگە ئەوانیش دەرکیان بە قووڵیی ماهییەتی ناخیان بکردایە کە بەقەدەر جیهانەکان فراوان و بەئەندازەی ئاسمانەکانیش قووڵە..! خۆزگە ئەوانیش وەك مرۆڤە ڕاستەقینەکان ئەو خاڵانەی ناخیان بدۆزیایەتەوە کە کراوەن بەڕووی ڕووناکیدا و، لە ڕێگا تەختەکانی ویژداندا و، بەو نوورەی کە بەدیهێنەری مەزن دەیبەخشێت بە چاوی دڵ، ئەوانیش نهێنییەکانی ئەو جیهانانەیان ڕاو بکردایە.

ئەوانەی کە ناتوانن ئەم ڕێگا ڕووناکانەی ناخیان بدۆزنەوە کە وەك چەند تۆوێك وان و، سەرتاپای تەمەنێك بێ ئاگا لە بەرزترین حەقیقەت دەژین و، لە ڕەهەندە ماددیەکاندا قەتیس دەمێنن و، پەی بە دووری و ڕەهەندە ڕەهاکان نابەن.. نازانم داخۆ بەزەییمان پێیاندا بێتەوە، یان دڵتەنگ ببین بە حاڵیان، یاخود دوعا بکەین و بپاڕێینەوە بۆ کرانەوەی چاوەکانیان..؟

# تەلیسمی كات

هەرگیز ناتوانرێت بوترێت كە ئێمە بەراورد بە وڵاتە پێشكەوتووەكان لە ڕووی هێزی ماددی و بەها مەعنەوییەكانەوە كەموكورتییەكمان هەیە. بەڵام ئەوەش حەقیقەتە كە لە بواری قسە ڕۆیشتن بەسەر كاتدا و، هاوئاهەنگی و تێكەڵاوی لەگەڵیدا و، بەكارهێنان و سوود وەرگرتن لە هەموو پارچەیەكی وەك گەوهەرێك، زۆر زۆر لە دوای ئەوانەوەین.

كات، بۆشاییەك نییە كە بەسەریدا بڕۆین و تێپەڕین، بەڵكو ئەو گەوهەرێكە دەقۆزرێتەوە و بەكاردەهێنرێت. لە بازاڕی هەموو ڕۆژ و سەردەمێكدا بەنرخترین كەرەستەیە و لە بازرگانیی ژیانی دنیادا سەرمایە و دەسمایەیەكە بەخشراوە بە مرۆڤ. ئەوانەی دوێنێ و ئەمڕۆ لە نهێنیی كات تێگەیشتوون، بە هۆی دەستەڵات پەیدا كردن بەسەر بوونەوەر و ڕووداوەكاندا، گەیشتن بە سەركەوتن و سەربەرزی.

ئەگەر بمانەوێت دیسان پێگەی بەرزی ڕابردوومان بەدەست بهێنینەوە

و، جارێکی تر سەردەمی شکۆداریمان زیندوو بێتەوە و، لەسەر ئاستی نەتەوەکان ببین بە لایەنێکی خاوەن سەنگ و قورسایی، سەرەتا پێویستە لەو ڕێگایانە بکۆڵینەوە کە چۆن کاتەکانمان بەڕێوە ببەین و، ئەم سەرمایە خواییە گەردیلەیەکی بەفیڕۆ نەدەین و، ڕێگا و شێوازی باشترین و جوانترین بەکارهێنانی کات فێری نەوەکانمان بکەین.

تاقە بناغەی ئەم ڕێگایەش بریتییە لە دەست گرتنی توند و تۆڵ بە "ڕابردوو"مانەوە و، داڕشتنی نەخشە و پلانەکانمان سەبارەت بە "ئایندە" لەژێر ڕووناکی ئەم بیر و بۆچوونەدا و، کاتێکیش ئەمانە دەکەین پێویستە بە عەدەسەی تێگەیشتن لەو کاتی "ئێستا"یە بڕوانین کە تێیدا دەژین. ئەگینا ئەگەر دوێنێ شکۆدار و بەختەوەر بووبین، بە ئەمڕۆ چی؟ ئەگەر ئێستامان بە شێوەیەکی گشتی خۆش و باش و جوان بێت، ئایا چی لەمانە بە میرات دەمێنێتەوە بۆ ڕۆژانی داهاتوو؟ بەڵێ، ڕابردوو دەبێت وەك تاجی سەر ڕێزی لێ بگیرێت و شانازی پێوە بکرێت، بەڵام پێویستە بە هەمان ئاست هەوڵ و کۆشش بۆ داهاتووش بدرێت، تا ڕابردووە شکۆدارەکان تەنها چەند ئەفسانەیەك نەبن لە دووتوێی لاپەرە زەرد و مۆرانە خواردووەکاندا..!

ئەم بوونەی کە هەر گەردیلەیەکی جیهانێکی حیکمەتە و هەر چرکەیەکی وانەیەك و پەندێکە، سەبارەت بەو ڕۆحە بێدارانەی کە بە وریاییەوە تەماشای دەکەن، کتێبێکە هەر لاپەڕەیەکی سەرچاوەی ئیلهامە بۆ دڵان و، هەر دەنگێکیش لەوەوە دەبیسترێت گوفتارێکە مەعریفەت بەرهەم دەهێنێت.

سەیرکردنی خۆری درەوشاوە و ئاسمانی شین و ئەو دەریایانەی کە بە فراوانییان بیرۆکەی ئەبەدییەتمان یاد دەخەنەوە، لێرە و لەوێ لە نێوان لوتکە و پێدەشتەکاندا تەماشا کردنی دەوروبەر بە سیفەتی جێنشینی سەر زەوی، بینینی قووڵایی "شوێن" بە یارمەتی تەلەسکۆبەکان و نزیك بوونەوە لە ئەستێرە دوورەکان، نزم بوونەوە بۆ ناو جیهانی مێرووە گچکەکان و تێکەڵاوی لەگەڵیان، لە بەدوای یەکدا هاتنی بەهار و هاوین و پایز و زستاندا هەست پێ کردن و ناسینی ڕووداوە سروشتییەکان، دووبارە بیرکردنەوە و تێڕامان لە جیهانی چاو و گوێ، لە قووڵاییەکانی دارستاندا گوێ هەڵخستن بۆ دەنگە نامۆکان و، هەڵکردنی نەرم و شیرینی با و، خشەخشی درەخت و گەڵاکان و بیستنیان، کردنەوەی ئامێرەکانی بیستن لە هەمبەر غەزەلخوانە دڵ سووتاوەکانی ڕۆژ کە لەسەر لقی درەختەکان هەڵنیشتوون و، گوێ گرتن بۆ وتاربێژە گۆیاکانی شەو، هەوڵدان بۆ بینینی لایەنی داهێنان لە سیمای پەرستگا و کارە هونەرییەکانی تردا، سەیر کردنی یەك لەدوای یەکی گەرم و سارد و، تاڵ و شیرین و، جوان و ناشرین و، بینینی گیانی کۆکەرەوە لە شتە دژیەکەکاندا، لە هەموو چرکە و یەك لە دە و یەك لە سەدی چرکەیەکی ژیاندا، زیاد کردنی تابلۆ جۆراوجۆرەکانی بیرکردنەوە بۆ دنیای داهاتوو و، سڵاو کردن لەو دۆزینەوە نوێ و پێکهاتە تازە و شیکارە پاراوانەی کە لە جیهانی ڕۆح و ئاسۆکانی گەردووندا بەرهەمیان دێنین... بەڵێ، ژیان لەگەڵ هەموو ئەمانەدا و، خێرا کردنی ڕەوتی کات و، پاشان لە کۆتاییدا کشانەوە وەك "هیچ"ێك لە مەیدان... ئەمەیە ڕێگای ڕۆشنی یەکانگیر بوون لەگەڵ کاتدا..!

ئیتر با ئەوانەی کە دەم لە کورتیی کات دەکوتن و، ئەوانەی سکاڵا لە دەست سەرقاڵی دەکەن و، ئەوانەش کە هەمیشە جوێن بە کات و زەمانە دەدەن، لە بێناگایی گومڕایی خۆیاندا بتلێنەوە. وەلێ ئەو ڕۆحە مەزنانەی کە هەموو پارچەیەکی کات بە ئیلهامەکانی ڕۆحیان دەنەخشێنن، هەمیشە "کات"یان لە ئەندازەی خۆی فراوانتر و زۆرتر دیوەتەوە و، بە قۆستنەوەی ئەم دیارییە خواییە، کونج و قوژبنی ڕووداو و بوونەوەرانیان پشکنیوە. غەزالییەکان بەم بێداری و دیقەتە پەییان بە حەقیقەتی جیهانی ئەودیوی بوون بردووە و لەودا گەیشتوون بە بوونی دووهەم، مەولاناکان بە هەناسە پڕ خرۆشەکانی کات لە هۆشی خۆیان چوون و چەشنی ناڵەیەك هەموو لایەکی دنیایان پڕ کردووە، نیوتنەکان بچووکترین ڕووداوەکانی وەك کەوتنە خوارەوەی سێوێکیان بە گرنگ زانیوە و، "یاسای کێشکردن"ی نێو سینەی کتێبی گەردوونیان دۆزیوەتەوە و، سەلماندوویانە کە کات بەشی هەموو شتێك دەکات. ئەم باڵابەرزانەی کە یەکانگیربوون لەگەڵ کاتدا، بە باشترین شێوە کەڵکیان لە میراتی ڕابردوو وەرگرتووە و، ئەو ڕۆژگارەش کە تیایدا ژیاون وەك پەمووی بەردەستی هەلاج شیپانکردووەتەوە و، لەو ڕۆژەشەوە کە دەرکەوتوون و ناسراون، لە گشت لایەکی دنیادا بە ڕێزەوە ناویان دەهێنرێت و، بە چەشنی ئەو تۆوانەی کە لەسەر سنگی تاشەبەردەکان سەوز دەبن، ئەوانیش ڕەگی خۆیان لە ویژدانی سەرەتاییترین کۆمەڵگەکاندا چەقاندووە.

ئەوە بەختەوەرەکانی داهاتوو بە باشترین شێوە سوود لە کات دەبینن و، دەزانن چۆن لە کاتی بیرکردنەوەدا کار بکەن و، لە ناوەندی کاردا

بخوێننەوە و، کاتێکیش دەخوێننەوە خزمەت کردن بە ئامانج و هزرە باڵاکانیان فەرامۆش ناکەن. دەزانن چۆن هەمیشە زیندوو و هەردەم ڕەنگاوڕەنگ بن.

# دایک[1]

دایك لە دنیای خۆیدا بوونەوەرێکی جەمسەری و تەوەرەییە. هەروەك چۆن ڕۆح و مانا و ناوەڕۆك و نەخشەی حەقیقەتی هەموو گەردوون کەعبەیە و، هیی شارەکانیش مەککەیە و، هیی سەرجەمی جەستەش مێشکە، بەهەمان شێوە دایکیش بناغە و کۆڵەکەی تاکەکانی خێزانە و، بریتییە لە گرنگترین کەرەستەی قودرەتی بەدیهێنەر لە خێزاندا. لەماڵدا هەموو شتێك بەدەوری ئەودا دەسووڕێتەوە و گشت شتەکانیش دەچنەوە سەر ئەو. بەڵام ئەو وەك ئەستێرەی باکوور بەدەوری خۆیدا دەسووڕێتەوە و لە تەوەرەیەکدا دەجووڵێتەوە کە ئەوسەری بەر ئەودیو ئاسمانەکان دەکەوێت.

بەڵێ، دایکان لە دنیادا کۆمەڵە بەدیهێنراوێکن کە خولگەیان عوقبایە. ڕوونترین بەڵگە لەسەر ئەمە ناهاوسەنگی نێوان ئەو نارەحەتی و ڕەنج و ئازارەی دێتە ڕێیان لە کاتی بەجێهێنانی ڕۆڵی بەدیهاتنیان و، ئەو

---

١. پێویستە لێرەدا ئەوە یاد بخەینەوە کە دەبێت قوڵایی جیا و تایبەتمەندی جیا و تێبینی جیای دنیای "باوك"یش لەکاتێکی تر و بابەتێکی سەربەخۆدا تاوتوێ بکرێت. (دانەر)

پاداشت و دیارییەیە کە لە بەرامبەریدا وەریدەگرن. بۆ تێگەیشتن لەمە پێویست بە لێکۆڵینەوەی دوور و درێژ ناکات، لام وایە تەنها ڕوانینێك بۆ ئەوەی دەیچێنن و ئەوەی دەیدورنەوە و، ئەوەی دەیبەخشن و ئەوەی وەریدەگرن، سەروو زیادە.

دایکان سیمایان بەقەدەر حۆرییەکانی بەهەشت ئاخیرەتی و، نیگاکانیان بەئەندازەی ئەوانەی فریشتەکان قووڵ و، هەستەکانیش وەك هیی ڕۆحانییەکان پاك و بێگەردە.. ئەوان گوڵی زەمینەیەکی وا پیرۆزن کە ئاو و خاك و هەوای لەودیوەوە بۆ هاتووە و، هێندە خۆشەویست و جوان و ئەفسووناوین کە ئەگەر مرۆڤ بە وردی تەماشایان بکات، سیحرێکیان تێدا بەدی دەکات کە سنوورەکانی جیسمانییەت و، دنیا و شتانی ناوی و، تەنانەت خۆیشیان، دەبەزێنێت و جێی دەهێڵێت.

ئەو ڕۆحانەی کە کراوەن بەڕووی هەستکردن و بیرکردنەوەدا، لە دنیای هەمیشە پڕ لە هەست و شەفەقەتی ئەواندا، وێنەی ئەو شیرینترین خەونانە دەبینن کە بە بیر و بۆچوونە فیردەوسییەکان گۆش کراون و، دەگات بە زەمزەمەی چێژێکی وەها کە توانای خەیاڵی مرۆڤ تێدەپەڕێنێت. ئێمە لە هەرێمی ئەواندا شەوان بە شێوەیەکی جیا و ڕۆژانیش بە جۆرێکی جیاواز، شنەبای دڵارامی هەست پێ دەکەین و، لە ڕۆحیشماندا هەست بە بارینی میهرەبانیی و بەزەیی و شیعری ئاسمانەکان دەکەین و، وا دەزانین کە ئاسۆکانمان بە فریشتەکان و ڕۆحانییەکان تەنراون. مەگەر خوا بۆ خۆی بزانێت چەند جار لە ڕوخساری ئەفسووناوی وەنەوشەڕەنگی ئەواندا، بینیومانە کە ڕۆح

و مانای بناغەی بەدیهاتن، هەموو کات و شوێنەکانی تێپەڕاندووە و ڕژاوەتەوە ناو ماڵمانەوە و، لە خەم و شادی ئەواندا هەستمان بە درەوشانەوەی ڕەحمەتێکی فراوان کردووە کە ڕەگەکانی لە ئەبەدییەتدایە و، بە کاریگەری کۆمەڵێك پاڵنەری نەزانراو و داخراو، ویستوومانە خۆمان لە باوەشی ئەوان بهاوین. کێ دەزانێت چەند جار شکاوین و زەرد بووین و سیس بووین و هەڵوەریوین و، خۆمان هەڵداوەتە سینەی پڕ تەلیسمی ئەوانەوە کە بۆنی هیوا و دڵنیایی لێ دێت و، لە هێلانەی چۆلەکەکان گەرمتر و زیندووتر و ڕوونترە و، بە ورتە پڕ لە نهێنییەکانیان لەم حەز بۆ ئەو حەز باڵمان گرتووە و، لە ئاسوودەییدا تریقاوینەتەوە.

ئەوان هەر کاتێك دەمانگرن بە سنگیانەوە، حاڵێکی سەیر داماندەگرێت و وەك قارەمانێکمان لێ دێت کە چاوەڕێی پاداشت ناکات و، ئێمەش وەك ئەوان هەست بە ئاشتی و ئارامیی دەکەین و، هێزێکمان دەدەنێ لامان وایە دەتوانین بەسەر هەموو بەربەستێکدا سەربکەوین.

دایك بەقەدەر ئاسمانەکان قووڵ و، بە ئەندازەی ئەستێرەکانی ئاسمانیش پڕ لە نهێنییە، چەشنی گڕکانێك یاخود ڕووبارێکی ژێر زەوی، هەست و نەستەکان تیایدا قوڵپ دەدەن. بەڵێ، ئەو نێوانی خۆشە لەگەڵ تاڵی و شیرینییەکانی قەدەر.. ڕێکە لەگەڵ خۆشی و ناخۆشییەکان.. چاوەڕوانی بەرامبەر نییە و، گرنگی بە پاداشت نادات و، لە جگەرگۆشەکانی زویر نابێت.. نموونەیەکی باڵای وەفا و شەفەقەتی وایە کە سروشتی بە ڕەوشتی خوایی هەڵشێلراوە و، نە ئەو ناڕەحەتییانەی کە چەشنی ئارەقی مەحشەر تا گەروو دێن و، نە بێوەفایی منداڵ کە وەك زوقمێك هەڵدەکات

و ڕۆحی دادەپۆشێت و، نە تامی تاڵترین غوربەت، ناتوانێت چۆك بە ئەو دابدات و بیخاتە لەزین...

لە منداڵیمەوە هەر کاتێك ئەو ئەفسانەیەم بیرکەوتبێتەوە کە جارێکیان بکوژێك دەستی دەچێتە خوێنی دایکی خۆی و، کاتێك بە هەڵە چەقۆکە لە دەستی خۆی دەدات و، بێ ویستی خۆی هاواری "دایە گیان!"ی لێ بەرز دەبێتەوە، لەناکاو لە جگەری تەرمی مردووی دایکییەوە وەڵامی "ڕۆڵە گیان!" دێتە بەر گوێ! بەڵێ، هەر کاتێك ئەم ڕووداوەم بیرکەوتبێتەوە، مووچڕکە بە گیانمدا هاتووە و، لەم نێو دڵۆپەدا هەوڵم داوە هەست بە شەفەقەتی ڕەهای دایك بکەم. بەتایبەت ئەو دایکانەی کە باوەڕیان بە ئەبەدییەت و دواڕۆژ هەیە و، لەپاڵ لاشە و جەستەیاندا، گیانی و ڕۆحین!. ئەمانە لە جیهانی تێکەڵی ماددە و مانا و، لاشە و ڕۆحدا، لە بەرامبەر جگەرگۆشەکانیاندا دڵیان خاوەنی پەیوەندییەکی وەها بەهێزە کە ئەو پەیوەندییانەی ئەهلی دنیا بەلایانەوە بەهێزترین و ڕەگداکوتاوترینە، لەچاویدا لە حوکمی چەند سێبەرێکی لاوازدان. بەڵام ئەوەندە هەیە تێگەیاندنی ئەمە بۆ ئەو کەسانەی کە هەستیان بە چێژی ئیمان و ئەو نەمرییە نەکردبێت کە لە ئیماندا هەیە، زۆر ئاسان نییە.

بەڵێ، باسکردنی ئەوەی کە دایکان دڵسۆزییان هەمیشە بە قووڵی دەمێنێتەوە و، ئیخلاسیان بە بێ بچڕان بەردەوامە و، دڵیان هەردەم بە خۆشەویستی دەجۆشێت و، نیگاکانیان کاتێك دەڕژێنە ناخمانەوە پەیمانی ئارامی دەدەن و، پڕبوونیان لە هەستی هەتاهەتایی و ئاخیرەتی لە کاتێکدا لە دۆڵەکانی فەنا و لەناوچووندا گەورە بوون، پێدەچێت کارێکی یەکجار سەخت بێت...

بیرێك بکەنەوە داخۆ ئەوان لەپێناوی ئێمەدا چەند چاوەڕوانییان کردووە!. سەریان بەر چەند لەمپەڕ کەوتووە و چییان تێپەڕاندووە؟. ڕووبەڕووی چ کارەساتگەلێك بوونەتەوە و چەند ڕۆژ و شەو بە خەیاڵ و خەمی ئێمەوە هەستاون و دانیشتوون؟. لە چەند خولیا و خەون پڕبوون و خاڵی بوونەتەوە، چەند جار نائومێدی و دڵ شکانەکان زویریان کردوون؟. سنگیان داوەتە بەر چەند ناڕەحەتی و چەند ژان و ئازار دڵیانی گوشیوە؟ چەند جار بە دەنگی بەرز گریاون و چەند جاریش هەنسکەکانیان بە ئەسپایی قووتداوە؟. چەند جار بەزەییان بەخشیوە و چەند باریش هەستیان کردووە پێویستییان بە بەزەییە؟. بەکورتی لەبەر خاتری ئێمە چ شتانێکی بەنرخیان بەخت کردووە و چ ئەرك و ماندووبوونێکیان کێشاوە.. پاشانیش چاوەڕێی هیچ جۆرە پاداشتێکیان نەکردووە...

بەڵێ، ئەگەر بوونەوەرێك هەبێت کە لە هەموو لاپەڕەیەکی ژیانماندا بمانگرێتە باوەش و، بۆنمان پێوە بکات و، دەست بهێنێت بە سەرماندا و، هەڵچوون و ئازارەکانمان هێور بکاتەوە و، خۆی نەخوات و دەرخواردی ئێمەی بدات و، خۆی ڕووت بێت و ئێمە پۆشتە بکات و، هەست بە برسێتی و تێریی ئێمە بکات لە خۆیدا و، لەپێناو بەختەوەری ئێمەدا بە وزەیەکی سەروو ئاستی مرۆڤەوە بەرگەی هەموو ناخۆشی و ناڕەحەتییەکان بگرێت.. ڕێگاکانی گەورەبوونی لاشە و، بەهێزبوونی ئیرادە و، تیژبوونی زیرەکی و، ئاخیرەتی بوونی ئاسۆکانمان پیشان بدات.. بەڵێ، ئەگەر کەسێك هەموو ئەمانەمان بۆ بکات و لە بەرامبەریشدا چاوەڕوانی هیچ جۆرە پاداشتێکی دیار و نادیار نەکات، تەنها و تەنها دایکە.

ئێمه بەشێکی گرنگی ژیانمان لە کەشوهەوای ئەواندا و لە باوەشی پارێزەریاندا بەسەردەبەین کە لە باڵە ڕەنگاوڕەنگەکانی تاوس جوانتر و، لە دنیای ئەفسووناوی گوڵان سیحرئامێزتر و، لە هێلانەی باڵندەکان گەرمتر و زیندووتر و، لە مەحکەمترینی قەڵاکانیش پارێزراوترە. بەڵێ، ئێمه خۆشی و جۆش و خرۆش و، نیشان دان و ئەندازەکاری و، سیستەم و ڕێگای پارێزگاری و پاراستنمان لەواندا بینیوە و، لەوانەوە ناسیومانن و، لەواندا هەستمان پێ کردوون و تاممان کردوون. بە تایبەت کاتێك لاوازی و پێویستییەکانمان یەکیان گرتووە لەگەڵ نەبوونی و ناسۆر و ناڕەحەتییەکانی ژیاندا و هێرشیان بۆ هێناوین، هەمیشە پەنامان بۆ ئەوان بردووە و، ویستوومانە بەهۆی ئەوانەوە لە مەترسییەکان بپەڕینەوە. هەر کاتێکیش پەنامان بۆیان بردبێت، ئەوانیش بەوپەڕی گەرمییەوە نووساندوویانین بە سنگیانەوە و، فووی دڵنیایی و ئاسوودەییان لە دڵی پڕ ئێش و ژانمان کردووە.. لەم جۆرە حاڵەتانەدا وابزانم بەنزیکەیی هەموو کەسێك، هەم لە دڵی خۆیەوە و، هەم لە نیگا و زەردەخەنە و جووڵەی دەستی ئەوانەوە، هەست بە هەڵکردنی زریانی هەستەکان دەکات و، شنەبای شەفەقەت دەیگرێتەوە و، وەك ئەوە وایە گوێ لە هۆنراوەیەکی هێمن بگرێت.

ئێمه لەو شەو و ڕۆژە پڕ لە هەست و خولیایانەدا کە لەگەڵ ئەوان بەسەرمان بردوون، لەڕاستیدا لە خەونێکی لێوانلێو لە بەختەوەریدا ژیاوین. ئێمه لەو کاتژمێرانەدا کە ئاسمان تیایدا شینە، جوانترین نەغمەکانی ژیانمان لە سینەی دایکانەوە بیستووە و، لە هۆش خۆمان چووین و، لە بەردەم خۆمانەوە وتوومانە: "دەبێت بەختەوەری هەر ئەمە بێت!"

دایك، گرنگرتین بناغەی بەدیهاتن و، بەفەڕترین گۆشەی دنیای مرۆڤایەتی و، ڕووناکی چاوی ئێمەشە. هەموومان لە بەرامبەر ئەواندا لارەملین و، قورسترین لێپرسراوێتیمان لەسەر شانە و، قەرزێکمان لە ئەستۆدایە کە هەرگیز پێمان نادرێتەوە.

پێدەچێت دایکان ئەو کانیاوانەی بەهەشت بن کە فریشتەکان لەسەریان هەڵدەنیشنەوە.! ئەگەر وا نەبووایە چۆن ڕووناکی ڕۆحیان بەم ئەندازەیە بەر شەوارەیان دەخستین؟ ئەمێستا باشتر هەست دەکەم کە نەك هەر ڕووناکییەکەی، بەڵکو سێبەرەکەشی پەروانەکان دەسووتێنێت و، ڕووناکییەکەشی سەرچاوەیەکی ڕۆشنی پڕ لە تەلیسم و مەتەڵە و، دڵان نوقمی ڕۆشنایی دەکات.

دایك، بە نەرمونیانیی ناو ڕۆحی و، ئازایەتیی و گیانفیدایی، پاڵەوانێکی شەفەقەتی وەهایە کە ئەگەر لە ڕووی میهرەبانی و بەزەیی و نەرمونیانییەوە هەڵبسەنگێنرێت، لە پاڵ ئەوەدا کە چەشنی پەڕێك نەرم و، وەکو ئاوریشمێك جوان و ناسکە، کەچی لە پاراستنی منداڵەکانیدا وەکو شێرێکی مێیینە ڕەق و توندە.

لە ژێر ئەم ئاسمانەدا هەر چی هەیە، دەستی ئەو لە سەرووی هەموویانەوەیە.. ئەو ڕێگایەش کە بۆ بەهەشت دەچێت بەژێر پێی ئەودا تێپەڕ دەبێت.

خوا لە کتێبەکەیدا گەورەیی و مەزنییەکی وای پێ بەخشیوە کە لەچاویدا دەسەڵاتدارییەکانی سەر زەوی وەك چەند تاجێکی وشك وان

له چەند سەرێكدا كە شایانی نین. هەرگیز ناتوانرێت بوترێت ئەو تاجی سەرانەی شوێنێكیان لەژێر پێیەكانی ئەودا بۆ خۆیان نەكردووەتەوە، خاوەنی هیچ بەهایەكی جێگیر و ڕەگداكوتاو بن.

ئەی ئەو بوونەوەرە مەزن و بەنرخەی كە وەك ڕۆحەكان ناسك و، مانەندی فریشتەكان بێتاوان و، چەشنی ئاسمانەكان فراوان و قووڵیت، جیهانی غەیب نرخێكی لەسەر داناویت كە لە سەرووی هەموو نرخەكانەوەیە و نازت هەڵدەگرێت. ناوبانگی بەستەی تۆ هەتا ئەو شوێنە دەگات كە تیایدا فریشتەكان هەڵدەستن و دادەنیشن و، گۆرانی ژیانت لە بنارەكانی بەهەشتدا دەنگ دەداتەوە. تۆ هەمیشە قولاپی هەستەكان لەناو جەرگتدا بوو و ملوانكەی گەوهەری دینداریش لە ملتدا! وە بەم شێوەیە ژیایت! ئێمە هەموومان بەندەی تۆین و، تۆیش بە داوی شەفەقەت و وەفا و دڵسۆزی دیلت كردووین و، سوڵتانێكی بێ تاجیت! ئەگەر لەم دنیایەدا هەموو شتێك ڕۆحێك و گەوهەرێكی تایبەت بە خۆی هەبێت، دەبێت گەوهەری ژیانی ئێمە تۆ بیت!

خوای گەورە لە سپێدەی قیامەتدا بە نووری زاتی خۆی ڕووناكت بكاتەوە! ئایندەشت وەك بنارەكانی ڕۆژی جومعەی بەهەشت جوان و، ویساڵیشت پیرۆز بێت!

چاخی خێرایی

یان

نزیکبوونەوەی

کات

# چاخی خێرایی یان نزیکبوونەوەی کات

هیچ گومانێك لەوەدا نییە کە ئەم سەدەیە چەرخی خێراییە. ئەوەش حەقیقەتە کە ئەم دنیا خێرایە بە گشت لایەنە جۆراوجۆرەکانیەوە بەڵێنی چەندین شتی جیاوازمان پێ دەدات. دابین کردنی حەوانەوە و بەختەوەری و پاڵدانەوە و خۆشگوزەرانی بۆ کۆمەڵێك.. تەسك بوونەوەی ماوەی نێوان دیزاینی شتێك و بەرهەم هێنانی.. چوونەوەیەکی شوێن و دوورییەکان و، گەیشتنی خێرا بە شوێنی ئامانج، یاخود رێ گرتن لێی بەشێوەیەکی چاوەڕواننەکراو.. سەرهەڵدانی لەناکاوی جەنگ و رێکەوتنەکان.. ئەمانە ئەو شتانەن کە بە خێرایی دێن! لەوانەیە لە داهاتووشدا بە دنیایەك ئاشنا ببین کە ڕووداوەکان بە خێرایی کات تیایدا ڕوودەدەن. هەرچەندە دەستکەوت و زیانەکانی دنیایەکی لەم جۆرە کە توانای خەیاڵ و پێشبینی ئێمە تێدەپەڕێنێت، زیاتر بابەتی ئەو گۆڤار و فیلمانەیە کە سەرقاڵی زانستی خەیاڵین[1]،بەڵام پێویستە مرۆڤەکان بترسن لە خێراییەك

---

١. زانستی خەیاڵی (science fiction) ئەو کتێب و فیلمانە دەگرێتەوە کە گرنگی بە خەیاڵکردن (تەسەوورکردن)ی پێشکەوتنە زانستی و تەکنەلۆجییەکانی ئایندە دەدەن و، لە کاریگەرییەکانیان لەسەر تاك و کۆمەڵگاکان دەکۆڵنەوە و زیاتر خۆی لە بابەتەکانی گەشت کردن بەناو کات و شوێن و هەبوونی ژیان لە شوێنانی تردا دەبینێتەوە.

کە خۆی ڕادەستی حەق و دادپەروەری نەکردووە..!

خێرایی، بە دروستبوونی "شوێن" پەیدابوو و بە بەدیهاتنی مرۆڤیش هەستی پێ کرا و ناسرا. سەرەتا ئێمە خێراییمان لە پێیەکان و ڕۆیشتنی مرۆڤدا ناسی و پێی ئاشنا بووین، پاشان چووە ناو مێشك و بڕیاردانەکانی مرۆڤ و بەدرێژایی کات فراوان بوو و گەشەی کرد، هەتا گەیشت بەم خێراییە سەرسووڕهێنەرەی ئەم ڕۆژگارە.

بەڵێ، خێرایی سەرەتا لە قاچەکانی مرۆڤدا و پاشان لەسەر پشتی ئاژەڵە ماڵییەکان و، ئنجا بەهۆی ئامێرە چەرخەدار و ماتۆڕەکان و، پاشان بە سواربوونی پشتی ئامێرە مۆدێرنەکان بە ئەمڕۆ گەیشت. هەنووکە "خێرایی" بە هەموو هێزی خۆی بەرەو داگیرکردنی مەوداکان تێدەکۆشێت. خۆی لە خۆیدا گواستنەوەی دەنگ و ڕەنگەکانیش چەندین فەرسەخ لە پێش گواستنەوەی تەنەکانەوەیە.

ئەم گۆڕانە لە خێراییدا لە هەمان کاتدا هەندێك ئاسانکاری و حەوانەوە و پاڵدانەوەی لەگەڵ خۆیدا هێنا. تەنانەت جاروبار ئەمانە پێش خودی خێراییش کەوتن. ئایا ئەم پێشهاتە ناهاوسەنگانە سەبارەت بە بەها ڕاستەقینە مرۆییەکان سوودبەخش بوون یان زیانبەخش؟ دەکرێت بابەتی پێگەی بەها ماددی و مەعنەوییەکانی مرۆڤ لە پێشکەوتنە تەکنەلۆجییەکاندا، لە داهاتوودا و لە جێگایەکی تردا تاوتوێ بکرێت.

سەبارەت بەم سەدەیەمان، ئێمە لە ڕێگەی کارەبا و ڕووناکییەوە شایەتحاڵی سەرسووڕهێنەرترین جۆری خێرایی بووین. بەجۆرێك بۆ

مەبەستی گواستنەوە سەیارە و کەشتی و شەمەمەندەفەر و فڕۆکە و، لە داهاتوویەکی نزیکیشدا مانگە دەستکردەکان و کەشتییە ئاسمانییەکان بەکاردەهێنرێن و، لە ماوەی چەند سەعاتێك یان چەند خولەکێکدا دەتوانن لە جێگایەکی دیاریکراوەوە بۆ مەودا هەرە دوورەکان بمانگوازنەوە. لە لایەکی تریشەوە ئەو ڕۆژانە نزیکن کە تیایدا ئاشنایی پەیدا دەکەین لەگەڵ سەرسووڕهێنەرترین و ئەفسووناویترین چوونەوەیەکی "کات" و کورتبوونەوەی "شوێن" و، کاتێك لە ماڵی خۆماندا دەحەوێینەوە، لە سایەی تەکنەلۆجیادا و بە تەنها پەنجە دانان لەسەر دوگمەیەك، دەنگ و ڕەنگ و تەنانەت بۆنیش لەوپەڕی دنیاوە بۆ ناو ماڵەکانمان دەگوازرێنەوە. بەڵێ، ئەو داهاتووە سەیر و سەمەرەیە زۆر نزیکە کە تیایدا شتە دەراسا کۆنەکان دەبن بە شمەکی ئاسایی و، نوێیەکانیش تەمەنیان زۆر درێژ نابێت و ، تەنانەت ئەو کەلوپەل و پێداویستییانەی بەکاریاندەهێنین بە چاککردنەوەیان ڕاناگەین.

ئاشکرایە ئەو سەرکەوتنەی مرۆڤ لە ڕابردوودا بەرامبەر کات و شوێن بە یارمەتی قاچەکانی و ئەسپەکەی و سەیارەکەی تۆماری کرد، بەهۆی ئامێرەکانی گواستنەوەی ئێستا و، لە سایەی کەشتیی ئاسمانی و مانگە دەستکردەکانی داهاتووشدا، دەگات بە خێراییەکی وا کە هەنووکە بە خەیاڵیشماندا نایەت. بەڵام لەپاڵ کۆمەڵێك ئاسانکاری و خۆشگوزەرانیشدا چەندین کێشەش لەگەڵ خۆی دەهێنێت. گەرچی ناکرێت دۆزینەوە زانستییە نوێیەکان و کارە دەراساکانی شارستانی نوێ بەرز نەنرخێنرێن. بەڵام ئایا ئەم خێراییەی ئەمڕۆ کە بەم هەموو هەوڵ و ماندووبوونە هاتووەتە بەرهەم و، مێشکی مرۆڤ و کتێبی بوونەرانی لەپێناودا وەك

پەمووی شیکراوەی بەردەستی هەلاج لێ کردووە، ئایا ئەم خێراییە خراوەتە ژێر فەرمانی چەند ئامانجێکەوە کە لە خودی خێرایی گرنگترن؟ "شوێن" کە هەموو ڕۆژێك پتر دەچێتەوە یەك و جیهانیش وەك گوندێکی بچووکی لێ هاتووە، "کات"یش کە تەسك دەبێتەوە و لە سفر نزیك دەبێتەوە، ئەگەر شوێنکەوتەی "خێرایی"یەکی بێ ئامانج بن، داخۆ خێراییەکی لەم شێوەیە چ سوودێکی بۆ مرۆڤ دەبێت؟ ئەگەر گەیشتن بە چەپەکترین جێگاکانی گەردوون و، شیکردنەوەی هەموو بوون و بوونەوەران و، ناسینی هەموو دنیا وەك گەڕەکەکەی خۆمان و، زانینی نهێنیترین شتەکان، لە پێش بەها مرۆیی و پێداویستییە مرۆیی و ئارەزووە مرۆییەکانمانەوە بێت، هەروەها ئەگەر بتوانین مەحرەمییەتی نەتەوەیی و نیشتمانی و خێزانی کەسانی تر ببینین، یان ئەگەر کەسانی تر مەحرەمییەتی نەتەوەیی و نیشتمانی و خێزانی ئێمە ببینن، ئایا ئەگەر پێشکەوتنێکی سەرشێتانەی وەك ئەمە نزمی و سووکییەکی جیهانی نەبێت چی ترە؟

ئێستا ئەگەر بڕیار بێت خێرایی لەپێناو چەند ئامانج و ئەنجامێکی تایبەتدا ویستراو و داواکراو بێت نەك لەبەر خودی خۆی، داخۆ مرۆڤی ئەم ڕۆژگارە بەهۆی سەیارە و شەمەندەفەر و کەشتیی دەریابڕ و ئەو فڕۆکانەوە کە خێرایی دەنگیان تێپەڕاندووە، گەیشتووە بەو ئامانج و ئارەزووانەی لەمەڕ بەها مرۆییەکان کە پێشتر نەخشەی بۆ کێشابوون؟ هەتا ئێمەش بە تاسەوە لە چاوەڕوانی خێرایی زۆرتر و نموونەییدا بین؟ زۆر سەختە ئەم پرسیارە بە "ئەرێ" وەڵام بدەینەوە. چونکە ئەمڕۆ خێرایی زۆر لەدوای ئەو ئامانجانەوەیە کە بۆی دیاری کرابوو...

بیر لە دنیایەك بکەنەوە کە تەکسی و سەیارە و شەمەندەفەر و بەلەم و فڕۆکەکان لێرە بۆ ئەوێ کۆمەڵێك مرۆڤی بێ ئامانج و، داخراو بەڕووی ژیانی ڕۆح و دڵدا و، بێبەش لە تێبینی ژیانێکی تر، وەك ئەوەی شمەك بگوازنەوە، دەهێنن و دەبەن و، سەردەخەن و دادەبەزێنن.. یان ئەمانە پێشکەوتنەکانی تەکنەلۆجیا وەك منداڵەکانی ناو شاری یاری بۆ ڕابواردن و سەرگەرمی بەکاردەهێنن.. تکاتان لێ دەکەم ئایا خێراییەك یان تەکنەلۆجیای خێراییەکی لەم شێوەیە چ سوودێکی هەیە؟

مادەم خێرایی لەپێناو ئەوەدا بێت کە لە ماوەیەکی کەمدا کارێکی زۆر بکەین و بگەین بە چەندین شوێنی زۆر، ئەگەر ئەو کاتانەی بۆمان دەگەڕێنەوە و، ئەو کارانەی دەکرێن و، ئەو شوێنانەی پێیان دەگەین، لەبەر خاتری چەند ئامانجێك نەبن لەودیو خێراییەوە، یونس ئەمرە گوتەنی هەوڵێکی ناکام دەرناچێت؟

بەڵێ، ئەگەر خێرایی لەپێناو ئامانجێکی دیاریکراودا نەبێت و نەخشەڕێگایەکیش نەبێت بۆ بەدیهێنانی ئەم ئامانجە باڵایە، ئایا هەموو هەوڵەکان و گشت ئەو کاتانەی بۆمان دەگەڕێنەوە، وەك ئەو کانیاوانە نابن کە بە خۆڕایی دەڕژێن و، ئەو هەورەبروسکانەی بە بۆشاییدا تێپەڕدەبن و، ئەو بارانانەی بەسەر بیابانە وشکەکاندا دادەکەن؟ لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا کۆمەڵێك لە لایەنگرانی خێرایی کە بێئاگان لە ئامانجەکانی ژیان، لە بەرامبەر ئەم سیستەمە سەرسووڕهێنەرەدا کە لە چەند کاتژمێرێکدا مرۆڤ دەگەیەنێت بە دەرەوەی بەرگەهەوا و، لە ماوەی چەند خولەکێکدا دەنگ و ڕەنگی ئێرە دەگوازێتەوە بۆ هەزاران کیلۆمەتر دووری و هیی ئەوێش دەگەیەنێت بە ئێرە، لەبری ئەوەی بیر

لە مانا و ئەنجامەکانی پشتی ئەم سیستەمە گەورەیە بکەنەوە، دەچن وەك شوانێکی نەخوێندەوار تەنها سەرسامن پێی و ڕووتی دەکەنەوە لە هەموو ئەو سوود و بەرژەوەندییانەی کە دەکرێت لێوەی هەڵبهێنجێرێت و، تەنها بەوەوە دەوەستن کە لەناو خۆیدا ڕاڤەی بکەن. ئەمە لە حاڵێکدا کە خێرایی تەنها ڕووداوێکی فیزیکییە و، ئەگەر ئامانجی نەبێت، نە بناغەی پێشکەوتن و شارستانێتییە و نە هۆکارێکیشە بۆ گەیشتن بە بەها مرۆییەکان. مرۆڤ لە سەردەمێکدا کە بە قاچەکانی یان بە سواری ئەسپ و وشترەکەی ڕێی کردووە، توانیویەتی بەختەوەر و خاوەنی شارستانێتی بێت. بەپێچەوانەشەوە لە کاتێکدا کە خاوەنی دنیایەك ئامێر و پێشکەوتنی زانستی بووە، کابووسی خوێناوی دیتووە و، بەتایبەت لەم چەرخەدا خوێنی هەڵهێناوەتەوە و، تەنانەت کاتێکیش بە دەستی شێتە خوێنرێژەکان کوژراوە، مەرگێکی شایان بە مرۆڤی بەنسیب نەبووە.

هەرگیز خێرایی یەکەم پێداویستی ئادەمیزاد نەبووە. مرۆڤەکان بۆ ئەوە ویستیان تا بگەن بەو شتانەی بەدوایدا دەگەڕان. ئەوانەی وا گومانیان برد کە مرۆڤ پێویستە بەشێوەیەکی ڕەها داوای خێرایی بکات و، ئەوانەش کە بەپێچەوانەوە سەنگەریان لە دژی گرت، لە بەرامبەر ئامێرەکانی گواستنەوە و گەیاندنی مۆدێرندا تووشی حاڵەتێکی نامۆی وا بوون کە یان بەتەواوەتی لایەنیان گرت، یان دژی وەستان. دەستەیەك خێرایی و ئامێرەکانی خێراییان بردە ئاسمانەکان و وەك بتیان لێ کردن و پیرۆزییان بەخشی بە پێشکەوتنەکانی بواری تەکنەلۆجیا، دەستەیەکیش لە هەمبەر پووچی و ڕەچاو نەکردنی ئامانج تیایدا دژایەتییان کرد. لەڕاستیدا هەردوو تاقمەکە قاچیان لە خودی خێرایی گیربوو و وەك موجەڕڕەدێك تەفسیریان کرد.

پێویستە خێرایی پێش ئامانجەکەی نەکەوێت و هەردەم لە پشتیەوە بێت. بەڵێ، ئەگەر "خێرایی"، ئادەمیزاد بۆ ئامانجە مرۆییەکان ئاڕاستە بکات و، یارمەتی بدات ئەم ئامانجانە بهێنێتە دی و، لەگەڵ خۆی ئاسوودەیی و بەختەوەریی بهێنێت و، حەسرەت نەهێڵێت و هیجران کەم بکاتەوە و، "کات" لە بەهەدەر ڕۆیشتن ڕزگار بکات و، هەوڵی چارەسەرکردنی کێشەکان بدات و، خزمەت بە ئاشتی جیهانی بکات و، هەوڵی چارەسەرکردنی کێشە دنیایی و ئاخیرەتییەکان بدات و، لێکۆڵینەوە و دۆزینەوە زانستییەکان خێراتر بکات، ئەوا شتێکی جوان و باش و پیرۆزە. هەر کاتێکیش لەمانە دابڕا و بە تەنها خۆی مایەوە، سەبارەت بە ئێمە جیاوازی نابێت لەگەڵ ئەفسانەیەکی بێمانادا.

ئەم شێوازی بیرکردنەوەیە دەربارەی ئامانج و مەبەستەکان، لە هەمان کاتدا جیاوازی نێوان ئێمە و کەسانی تر دەردەخات و، "خێرایی" لەوە دەرباز دەکات کە تەنها فەنتازیایەك بێت و، لە دنیای ڕۆحە نموونەییەکاندا ناوەرۆکێکی فراوانی پێ دەبەخشێت.

# ئاژاوە و باوەڕ

لەسەر ڕووی ئەم زەوییە هەتا ئەمڕۆ بەنزیکەیی لە هەموو سەردەمێکدا و لە شێوە و ڕەهەند و ئەندازەی جیاوازدا ئاژاوە سەری هەڵداوە و، قەیران بەدوای قەیراندا هاتووە و، بوومەلەرزەی مەعنەویی بە ئەندازەی چیاکان ڕوویداوە و، مرۆڤایەتی چەندین جار دووچاری نائومێدی و خەیاڵ شکان بووەتەوە.. هەزار جار پەشیمان بووە لەو دۆخە ناهەموارەی تێی کەوتووە و ناڵاندوویەتی. -نازانم داخۆ گیرۆدەبوونی بەدەست خۆی بووە یان نا..!- پاشان هەژانەکان تەواو بوون و، لە هەموو لایەکدا بەهار بەدوای بەهاردا هاتووە و، ڕۆژە تاڵەکان بەتەواوەتی لەبیرچوونەتەوە و، شوێنی خۆیان بۆ ڕۆژانی جوان و خۆش بەجێ هێشتووە.

مرۆڤی ئەم ڕۆژگارە دووچاری دڕندەترین و سامناکترین و بەربڵاوترین و خێراترین جۆری ئاژاوە و قەیران بوویەوە. وابزانم زەوی تا ئەمڕۆ لە هیچ سەردەمێکدا بەقەدەر ئەم چەرخە شایەتحاڵی شێتیی نەبووە. وەکو بێرنارد شۆ دەڵێت "ئەگەر لە هەسارەکانی تردا زیندەوەرانی وەك ئێمە

هەبن، بێگومان دنیاکەمان وەك شێتخانەیەك دەبینن." بەڵێ، مرۆڤی ئەم سەردەمە لەناو کۆمەڵێك قەیرانی بێوێنەدایە و، بەم حاڵەشی پتر لە شێتان دەکات و، دنیاکەشی بە شێتخانە دەچێت...

مرۆڤایەتی هەتا ئەم چەرخەی دواییی وەك چەند ڕووداوێکی هەرێمی و ناوچەیی تەماشای ڕووداوەکانی گۆی زەوی دەکرد. هەر بۆیە شەڕ و شۆڕ و جەنگەکانی ئەملا و لا نە زۆر سەرنجی ئەویان ڕاکێشا و نە زۆر تووشی ئەندێشە و ترسیشیان کرد. بەڵام هەنووکە دووری و سنوورەکان هێندە بچووك بوونەتەوە کە ڕووداوێك لە سووچێکی ئەوبەری دنیا، لە هەموو شوێنێك خۆی نمایان دەکات و کاریگەریی دەبێت. لەبەر ئەوە لە دڵەکاندا یان نائارامی و ئەندێشە یاخود خۆشی و ئاسوودەیی بەرهەم دەهێنێت.

بەڵام ئێمەومانان سەرەڕای هەوڵ و کۆششی دڵسۆزانەی چاکەخوازان، هەمیشە شایەتحاڵی ڕووداوە ناخۆش و جەرگبڕەکان بووین. وا دیارە تا ئەو ڕۆژەی خاوەنانی ڕاستەقینەی زەوی کە نوێنەرایەتی یەکانگیربوونی ژیری و دڵ دەکەن، دێن و قەدەری مرۆڤایەتی دەگرنە دەست، ئەم ئاژاوە و بەربادییە هەر بەردەوام بێت. هەر بۆیە ئەرکێکی زۆر دەکەوێتە سەر شانی نەوەکانی داهاتوو لە بواری ئاڕاستەکردنی هەموو ئەو ڕووداوانەی لە زەویدا ڕوو دەدەن، بە مەبەستی سوودی مرۆڤایەتی و خۆشبەختی ماددی و مەعنەوی مرۆڤ.

لەوانەیە هەندێك کەس کاتێك لەم هەموو کێشە و قەیرانانە دەڕوانن، بەئاگاهاتنەوەی مرۆڤایەتی و گەڕانەوە بۆ ناوەرۆکی ڕاستەقینەی خۆی

بە خەون و خەیاڵ بزانن و بگرە لەوانەیە بەلاشیانەوە مەحاڵ بێت. وەلێ ئێمە لە نائومێدترین کاتیشدا بە شتێکی گونجاومان زانیوە و هەمیشە چاوەڕوانی بووین. بەتایبەت لە سایەی ئەو هەستیاری و چاوکرانەوە و حەزی لێکۆڵینەوەیەی کە قەیران و ناخۆشییەکان لە ویژدانی گشتیدا هێناویەتە بەرهەم، باوەڕەکەمان زیاتر بەهێز بوو و ڕەگی داکوتی. لەو باوەڕەداین کە بێگومان لە داهاتوویەکی زۆر نزیکدا هەموو مرۆڤایەتی جارێکی تر هەندێك لەو بەها باڵایانە دەدۆزێتەوە کە بووبوون بە قوربانی چەند بەهەڵەداچوونێکی مێژوویی. دەیاندۆزێتەوە و وەك خاوەنێکیش پارێزگارییان لێ دەکات. چونکە مرۆڤایەتی هیچ کاتێك ئەو گەوهەرە ڕاستەقینەیەی ناخی کە پاڵی پێوە دەنێت بۆ گەڕانێکی لەم جۆرە، لەبیرنەکردووە. نە لەیادی چووە و نە ئامادەشە لەیادی بچێت. لە سەردەمە جیاوازەکانی ڕابردوو و لەمڕۆشدا، سەرەڕای هەموو جۆرەکانی گۆڕانی ڕیشەیی و بوومەلەرزەی مەعنەوی، هەستی "ئیمان بە خوا" هەرگیز نەگۆڕاوە و بگرە لەگەڵ هەموو ڕووداوێکی نوێدا پتر ڕەگی داکوتیوە و، هەمیشە یەکەم بابەتی مرۆڤایەتی بووە و، زیندووترین بیری مرۆڤ بووە کە ژاکان و کۆن بوونی بەخۆوە نەدیوە. ئەو تەوژم و هۆکارانەی کە دەیانەوێت مرۆڤایەتی لە گەوهەری باوەڕ دووربخەنەوە، چەندیش بەهێزبن، هێشتا لە دیدی مرۆڤایەتیدا ئیمان و باوەڕ مانشێتی ڕۆژنامەی ژیانی ئەو دەبن و، ئەم بابەتەش بە تێپەڕبوونی کات زیاتر و زیاتر بەنرخ دەبێت.

زیادبوونی ڕووتێکردنی خەڵکی بۆ کڵێساکان لە دنیای مەسیحییەتدا و، پڕبوونی مزگەوتەکان لە جیهانی ئیسلامیدا لە دوای ماوەیەك لە

سستی، ڕووداوێکی گرنگه و پێویسته هەڵوێستەی لەسەر بکرێت. هەتا ئەمڕۆ سەدان ئیمپراتۆرییەت هەزاران تاجداریان لەگەڵ خۆیاندا بەرەو ڕابردوو ڕاپێچ کردووه و، سیزارەکان و ئەسکەندەرەکان و ناپلیۆنەکان له یاداوەرییەکاندا سڕاونەتەوه، بەڵام گەوهەری ئیمان له سینەکاندا بێ ئەوەی هیچ شتێك له تازەیی و پاراوی خۆی لەدەست بدات، چاخەکانی تێپەڕاندووه و هەتا ئەمڕۆ به زیندوویی ماوەتەوه.

ئەگەرچی هەندێك لافی ئەوه لێ بدەن که هێزی باوەڕ لاوازه و مرۆڤه باوەڕدارەکانیش خاو و کاڵ و کرچن، وەلێ به لێکۆڵینەوەیەکی کورت و هەوڵێکی کەم یەکسەر دەردەکەوێت که ئەمه تەنها خەڵەتان و خەڵەتاندنه. پێش له هەر شت سەرژمێرییه ڕەسمییەکان دەریدەخەن که ژمارەی باوەڕداران له زیادبوونێکی بەردەوامدایه. بەتایبەت زۆربوون و گەشەسەندنی موسڵمانان لەسەر هەردوو ئاستی چەندێتی و چۆنێتی، هەر له ئێستاوه هەندێك بێباوەڕی ناڕەحەت کردووه. له پەکینەوه هەتا مۆسکۆ و لەوێشەوه بۆ هەندێك له وڵاتانی بەڵقان، لەژێر ئەو پەستان و فشارەدا که خراوەته سەر باوەڕداران، ئەم تۆوی ترسه خۆی حەشارداوه. بەڵام ئەوەنده هەیه ئەو شتانەی دەکرێن بۆش و تەقالاکانیش بێهوودەن. چونکه:

"تەجەللی حەق دەرکەوێ هەموو شت ئاسان دەکا،

به لەحزەیەك سەبەب دێنێته بوون و ئیحسان دەکا."

ئەگەر باوەڕ داخوازی سروشتی مرۆڤ بێت و گرنگترین پارچەی فیترەتی بێت، -کە هەر واشە- ئەوا بێگومان ڕۆژێك دێت کە هەموو هێزە ناسرووشتییەکانی بێباوەڕی و ئینکاری دەشکێنێت و ڕایدەماڵێت. جا چۆن وا نەبێت، لەکاتێکدا ئیمان مەشخەڵێکە خوا لە سینەکاندا دایگرساندووە و هەر ئەویشە کە پشتگیریی لێ دەکات.

"تەقدیری خودا بە هێزی بازوو ناگەڕێتەوە،

شەمعێك مەولا پێی کا، بە فوو ناکوژێتەوە.!"[١]

ملیۆنێك ساڵ پێش ئێستا هەموو شتێك لە بازنەی توانست و ئیرادەی خوادا تێکەڵ و پێکەڵ و لە دۆخی ناجێگیریدا بوو. لە لایەك بورکانەکان بە ڕقەوە ئاگریان بۆ چواردەوریان فڕێدەدا و، لە لایەکی تریش پرۆتۆپلازمایەکی[٢] بچووکی ناسك و گیایەکی لاواز.. کەچی لە کاتێکی زۆر چاوەڕواننەکراو و لەپڕێکدا ئەم بوونەوەرە لاوازانەی کە کەس حسابی بۆ نەدەکردن، ماراسۆنەکەیان بردەوە و، سەرەڕای "هەڵبژاردنی سروشتی"[٣]، بوون بە خاوەنی زەوی.

---

١. لەم ڕووەوە شاعیری گەورەی کورد (مەحوی) دەڵێت:

چرایەك نووری بێ چوونی مومیدی بێ، دەبێ وابێ...

چرایەك دەستی قودرەت خۆشی کا بۆ تا ئەبەد مانە...

٢. پرۆتۆپلازم بریتییە لە ماددەی زیندەیی خانەیەکی زیندوو.

٣. لێرەدا نووسەر پلار لە "هەڵبژاردنی سروشتی" دەگرێت کە بە یەکێك لە پایەکانی داروینیزم دادەنرێت، گوایە کاتێك کارەساتێك بەسەر سروشتدا دێت، سروشت هەڵبژاردنێك دەکات و بەهێزەکان دەهێڵێتەوە و لاوازەکانیش لەناو دەچن!

هەروەك ڕووبەڕووبوونەوەی مرۆڤ بەرامبەر ڕووداوە سروشتییە ترسناكانە سەرەتاییەكان، بە زاڵبوونی مرۆڤ بەسەر بوونەوەر و ڕووداوەكاندا كۆتایی هات، بەهەمان جۆر لە سەردەمە جیاوازەكانی مێژووشدا كاتێك مرۆڤایەتی گیرۆدەی هەزار و یەك ئاژاوە و قەیران بووەتەوە، لە ئەنجامدا ئەم جەنگە بە سەركەوتنی ڕۆحی مرۆیی تەواو بووە.

بەڵێ، تەنانەت لەو قەیرانە جیاوازانەدا كە چەندین ساڵ ئەوروپایان سەرەوژێر كرد، بەتایبەتی شۆڕشی فەرەنسا و ئەمریكا و، لەو ڕووداوانەشدا كە بە ڕژانی خوێنی هەزاران كەس كۆتایی پێ هات، ئێمە ئەمڕۆ كۆمەڵێك ئەنجامی جوانی ئەو ڕووداوانە دەبینین. ئەم ئەنجامە چاوەڕواننەكراوانەی كە بە ئاڕاستەی خۆشبەختی مرۆڤایەتی لەم ڕووداوە نەخوازراوانە كەوتوونەتەوە، مرۆڤەكانی ئەو سەردەمە نەیانتوانیوە بیبینن. چونكە نەیانبینی، ئەو سەردەمەی تیایدا دەژیان ناویان نا "ساڵانی بۆگەن".[1] وەلێ ئێمەومانان ئەمڕۆ ئەنجامە جوانەكانی پشتی ئەو چەرخە زریاناوییانە دەبینین و تێدەگەین كە ئەمانە بەهەڵەدا چوون.

مرۆڤی ئەم سەردەمەش بە مەرجێك باوەڕ و ئازایەتی خۆی نەدۆڕێنێت، دەتوانێت زاڵ ببێت بەسەر ئەو قەیرانە ئاڵۆزانەی هەموو لایەكی جیهانیان گرتووەتەوە. لەڕاستیدا لە دوێنێوە هەتا ئەمڕۆ هەمیشە سەردەمە هەرە ناشرینەكان بەدوایاندا چەرخە هەرە جوانەكان هاتوون،

١. ژان ژاك ڕۆسۆ ساڵانی شۆڕشی فەرەنسی بەهۆی ئەو كوشتن و بڕین و تۆقاندن و تیرۆرەی كە سەرانسەری وڵاتی گرتەوە، بە "ساڵانی بۆگەن" ناو دەبات.

ئاژاوەکان سکیان بە ڕێسا پڕ بووە و، ڕووناکییەکان تارکییەکانیان ڕاوناوە. کاتێك وا هەست دەکەین کۆمەڵگەکان تۆپەڵێکی ڕەق و تەق و بێ ناسنامەن، لە هەمان کاتدا یەکێکی خاوەن تایبەتمەندیی بەرز و ئیرادەی پۆڵایین و بیری ڕووناك، هاتووەتە مەیدان و ڕێگاکانی بوون بە مرۆڤی ڕاستەقینەی پیشان داون. لەوانەیە سەرەتا گاڵتەی پێ کرابێت و، بەرەنگاری بۆچوونەکانی بوویێتنەوە، بەڵام لە ئەنجامدا کۆمەڵگاکان بە هەوێنی ئەو پێگەیشتوون و، لەگەڵ ئەودا یەکانگیر بوون و، لەسایەیدا گەیشتوون بە بوونێکی تەواو جیاواز...

ئەوە پێغەمبەران و شوێنکەوتووانیان کە پیرۆزترینی ئەم کاروانەن..! ئەوەش کۆپەرنیکۆس و گالیلیۆ و ئەدیسۆن و ئەنیشتاین..! هەموویان دووچاری ڕەتدانەوە و بەرپەرچدانەوەی لە ژێری بەدەر هاتوون، بەڵام بەهۆی تەفسیری زەمانە، سەرەڕای دوژمنە لەژمارەبەدەرەکانیشیان، بە یەك جووڵە گەیشتوونەتە لوتکەکان.

لەو ڕۆژەوەی دنیا دروست بووە شتان نەگۆڕاوە و هەر بەم شێوەیە ڕۆیشتووە، ئەمرۆش هەمان شت ڕوودەدات. هەر ئەوەندە پێویستە کە مرۆڤی ئەم ڕۆژگارەشمان بزانێت لە بیر و باوەڕدا خۆی نوێ بکاتەوە و، لە بەرامبەر ڕووداوە ڕاگوزەرەکاندا هیوای خۆی نەدۆڕێنێت و، گرنگی لە ئەندازە بەدەر بە قەیرانە ماددی و مەعنەوی و کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکان نەدات و، لەو کارەساتە مەزنانە نەسڵەمێتەوە کە پێشی پێ دەگرن..!

# بتی زانست

لەمڕۆماندا زانستی مۆدێرن و پێشکەوتنی تەکنەلۆجی چاوی ئادەمیزادیان هێندە بەر شەوارە خستووە کە دوو هەنگاو بەر پێی خۆی نابینێت و، جگە لە زانست و تەکنەلۆجیا متمانەی تەواوەتی بە هیچ شتێکی تر نییە. نەك هەر متمانەی نییە، بەڵکو هەڵگری بیر و باوەڕێکی لنگەوقووچی وایە کە گوایا دەتوانێت بە پێشکەوتنی تەکنیکی مۆدێرن هەموو کێشەکانی چارەسەر بکات و گشت ئاستەنگەکانی بەردەمی تێپەڕێنێت. هەرچەندە پێشبینی کردنی ئەوەی کە بۆچوونێکی پەڕگیری وەك ئەمە چ زیانێکی مەزن بە مرۆڤایەتی دەگەیەنێت زۆر سەخت نییە، بەڵام ئێمە پێمان باشە بۆ بڕیاردان لەم ڕووەوە، زیاتر چاوەڕێی تەفسیری کات بکرێت. بەڵام پێویستە بڵێین کە هەروەك چۆن پەڕگیری و زیادەڕەوی لە هەموو شتێکدا زیانی هەیە، بە هەمان جۆر بە "بت" کردنی زانست و، گەڕاندنەوە و پەیوەست کردنی هەموو جۆرەکانی بەها پێیەوە، هەم بۆ مرۆڤایەتی و هەم بۆ زانستیش یەکجار زیانبەخش و مەترسیدارە.

بەڵێ، هیچ گومانێك لەوەدا نییە كاتێك زانست پێكهات لەگەڵ سیانەی "ژیری دروست -ئەزموون- ویژدان"، ئەوا بەسوودە و، لە سایەی بەرزكردنەوەی هەلومەرجی ژیانی كۆمەڵگاوە، دەتوانێت خۆشبەختی و ئاسوودەیی بە ئەمڕۆ و سبەینێی مرۆڤایەتی ببەخشێت. بەڵام ئەگەر بە تەنها مایەوە، هەرگیز نابێت ئەوە پشتگوێ بخرێت كە دەبێتە هۆكاری لادان و بەلاڕێدا بردن.

بەڵێ، لە جێگایەكدا كە زیهنەكان بێبەشن لە باوەڕی ئەبەدییەت و، ڕۆح دیلی تەكنەلۆجیایە و، ژیانی دڵیش بە تەواوەتی پشتگوێ خراوە، هەرگیز ناكرێت باس لە زانست و سوودەكانی بكرێت. بەپێچەوانەوە لە هەرێمێكی وادا زانست یارمەتی دڕندەیی دەدات و فرەڕەهەندیی پێ دەبەخشێت و، ململانێكان پتر توند دەكات و، هاریكاریی خەڵەتاندن و داگیركارییەكان دەكات و، دەیانكات بە پەتایەكی دێوئاسا و، لە بەرامبەر "حەق"یشدا لایەنی "هێز" دەگرێت.

زانست پێویستە ئامانجی بەختەوەری ماددی و مەعنەوی مرۆڤ بێت و، بە ئەندازەی هەوڵدانی بۆ شیكاركردنی كێشە جەستەیی و ڕۆحییەكانی مرۆڤ بەسوودە و، دەبێت بیگەیەنێت بە یەكێتیی دڵ و مێشك. لەو كاتانەدا كە ئەم ئەركانە جێبەجێ ناكات یان ناتوانێت بیكات، بێسوودە و، تەنانەت بە ڕوویەكدا زیانبەخشە و، چاوەڕێ كردنی سوود و قازانجیش لێی، كارێكی بێهوودەیە.

مرۆڤی ئەمڕۆ كە بەتەواوەتی ماددی بووە، تەنها بۆ مەبەستی حەز و چێژە كەسییەكان و حەوانەوەی ماددی گرنگیی بە زانست

و تەكنەلۆجیا دەدات. جیهانبینییەكی لەم شێوەیەش هەموو ڕۆژێك زیاتر بەرەو ڕووخانی ڕەوشتی و، قەیرانی دەروونی و، كرچوكاڵیی بیركردنەوەی دەبات. ئەم جۆرە لە مرۆڤ، خۆی نادات لە قەرەی گەڕان بەدوای حەقیقەت و بیركردنەوە لەپێناویدا، تەنانەت حەزی لێی نییە و خۆشی ناوێت. بێگومان لەمەدا هۆكارەكانی چەشنی باڵادەستیی كلتوری عەوامانە لە كۆمەڵگەدا و، بەلاشخۆری و هەلپەرستیی پیاوانی زانست و، قاتوقڕی كەسانی دڵسۆز و خەمخۆر، ڕۆڵێكی باڵای هەبووە. بەڵام كاریگەریی پێنەگەیاندنی كەسانی خاوەن دڵ و ڕۆح و ئیلهام و ویژدان، زۆر لەمانە زیاترە. لە سەردەمێكدا كە هەموو لایەك پڕ بووە لە داهۆڵگەلێك كە ژیریبان دابەزیوەتە چاویان و لە ماددەدا بەدوای هەموو شتێكدا دەگەڕێن، باسكردنی زانستی حەقیقەت و قووڵ بوونەوە تیایدا كارێكی مەحاڵە. بەپێچەوانەوە لە كەشوهەوایەكی لەم جۆرەدا بیركردنەوە و بڕیاردان هەموو ڕۆژێك زیاتر چاوی كز دەبێت و، مرۆڤەكان پتر بێعەقڵ دەبن و، دنیا پڕ دەبێت لە مرۆڤانێك كە بە فەرمانی ئامێرەكان دەڕۆن بەڕێوە.

هەر بۆیە ئەوانەی كە بەنیازن سەرلەنوێ جیهانی ئایندە بنیات بنێنەوە، ناچارن سەرەتا زۆر بە باشی بڕیار بدەن كە داخۆ زانست چییە و چی نییە و، دەكرێت چی لێ چاوەڕوان بكرێت و، ئامانجەكانی چین. ئەگینا كەموكورتییەكان هەر بەردەوام دەبن و زانستیش هەرگیز ئەو میوەیە نابەخشێت كە لێی چاوەڕوان دەكرێت.

وا هەست دەكەم بەشێكی زۆری ئەو كێشە و ئاستەنگانەی كە

ئەمڕۆ هەر لە دامەزراوەكانى پەروەردە و فێركردنمانەوە هەتا پۆستە باڵاكانى دەوڵەتى گرتووەتەوە، سەرچاوەكەى ئەم تێگەیشتنە كول و كاسە بێت لە زانستى پێناسە نەكراو و دەستنیشان نەكراو. پێم وایە دەزگاكانى پەروەردە و فێركردنمان كە تەنها گرنگى بە دیوى دەرەوەى شت و ڕووداوەكان دەدەن، هەتا لە گیانى حیكمەت بەدووربێت و، لە دامەزراوەكانیدا دەمارگیریى زانستى و بیرتەسكیى باڵادەست بێت، ئەوا نەوەكانیش بەردەوام دەبن لەسەر گرنگى دان بە ڕواڵەت و، ژیانى بیركردنەوەمان هێندەى تر تەسك دەبێتەوە و، ئەگەر دۆزینەوە تازەكانیش چەند ڕەچەتەیەكى ئەفسووناوى لەمەڕ ڕزگاربوونى مرۆڤایەتى بخەنە ڕوو، هێشتا ناتوانرێت ڕێگە لەم نەفامى و كۆنەپەرستییە جیهانییە بگیرێت كە هەموو سووچێكى دنیاى تەنیوە.

ئەگەر لە شوێنێكدا هەوڵ و دۆزینەوە زانستییەكان ئامانجیان بەختەوەریى ماددى و مەعنەوى مرۆڤ نەبێت و ملكەچى فەرمانەكانى ڕۆحى مرۆڤایەتى نەبن، زانست لە ئامانجى خۆى لایداوە و، تەكنەلۆجیا لەدژى مرۆڤایەتى كەوتووەتە كار و، ئادەمیزادیش سەرەڕاى بەها باڵاكانى، هەموو شتێكى لە دەست داوە.

مرۆڤ بوونەوەرێكى هێندە بێنرخ نییە تا بتوانرێت پشتگوێ بخرێت. ئەو، لە چەقى بووندایە و، بەدیهێنراوێكى ناوازەى خوایە و ڕازى نابێت بە هەبوونى شتێكى تر لە پێشیەوە یان لە سەروویەوە. ئەو زاتەى كە بوونەوەرانى بەدیهێناوە، مرۆڤى وەك پێڕست و پوختە و ئامانج و میوەى گەردوون دروست كردووە. ئامانجى مرۆڤێك كە ئەم پایە و پێگە بەرزەى

خەڵات کراوە، گەڕان و دۆزینەوەی بەدیهێنەرەکەیەتی و، زیادکردنی ڕەهەندی غەیبی و ئاخیرەتییە بۆ بوونە دنیایی و ماددییەکەی.

لەم حاڵەدا ئەو ئەرکەی کە دەکەوێتە سەر شانی زانست ئەوەیە کە پەردە لەسەر چاوی مرۆڤ هەڵبگرێت و ڕاستیی نیشان بدات و، ئامادەی بکات بۆ گەشتی نوێی ئاسۆکانی بیرکردنەوە.

لە سایەی ئەمەدا هەموو هەوڵ و دۆزینەوە زانستییەکان دەبن بە چەند پلیکانەیەك لە ڕۆحی مرۆڤدا کە درێژدەبنەوە بەرەو ئەبەدییەت و، ئەو ڕۆحە بەختەوەرانەش کە هەموو ڕۆژێك بە هەستێکی ئیمانیی جیاواز و عەشقێکی نوێی عیبادەت پەرواز دەکەن، بەهۆی ئەم پلیکانەیەوە لە ڕاڕەوە تەسکەکانی جەستە ڕزگاریان دەبێت و، دەگەن بە پێناسێکی سەروو کات و، دەبن بە هاودەمی نەمرییەك کە لە پشتی کات و شوێنەوەیە.

ئیدی بۆ کەسانی لەم جۆرە نە ئەو لایەنە زیانبەخشانەی سروشت کە دەیانەوێت بەرەو خوارەوە دایانبەزێنێنن، دەتوانن بۆریان بدەن و، نە لە تەم و دووکەڵەکانی جەستەدا تووشی سەرسووڕمان و حەپەسان دەبن. ئەم باڵابەرزانەی کە خاوێن بوونەتەوە لە سەرجەم ئەو تەم و ژەنگانەی چواردەوریانی تەنیوە، مەگەر خوا بۆ خۆی بزانێت ڕۆژانە چەند جار لەگەڵ بوونەوەرانی ئەودیو ئاسمانەکان ئاسیاوی پەیدا دەکەن و، چەند جار بە ئاراستەی جاویدانی ئەسپی خۆیان تاو دەدەن و پێشبڕکێ لەگەڵ فریشتەکان دەکەن و، بە گەرمیی حەقیقەت وەك مۆمێك دەتوێنەوە و تێکەڵی ئەو زەریا نەزانراوانە دەبن..؟

# بەرەو دنیایەکی نوێ

لە مێژووی جیهاندا هیچ سەردەمێکی تر بە وێنەی نیوەی دووهەمی ئەم سەدەیە لێوانلێو نەبووە لە دۆزینەوەی زانستی و، مرۆڤیش هیچ کاتێك دەوڵەمەندیی ماددی لەم شێوەیەی بەخۆوە نەدیوە و، بەم ئەندازەیەش نەگەیشتووە بە حەوانەوە لە سایەی تەکنەلۆجیادا. بەڵام لە بواری بڕیاردان لەسەر مانای مرۆڤ بوون و، ڕاڤە کردنی لەسەر ئاستی گەوهەرەکانی ناوەڕۆکی و، دیاریکردنی پێگەیەك بۆی بەگوێرەی بەها مەعنەوییەکانی، هەرگیز هیچ کاتێك بەقەدەر ئەم چەرخە دووچاری دوودڵی نەبووە و، گیرۆدەی داوی دژیەکییەکان نەبووە و، بە نادیاری نەماوەتەوە.

لە سەرەتای ئەم چاخەدا و لە دەزگا زانستییەکاندا ئەو بیر و بۆچوونە زاڵ بوو کە گوایا هەموو بەهاکان لەمەڕ بوون و مرۆڤ کە هەتا ئەم ڕۆژگارە پشتیان پێ بەستراوە، تووشی پووکانەوە و لەناوچوون دەبن. وا گومان دەبرا کە ژیری هەموو شتێك ڕوون دەکاتەوە و، سەرجەم گرێ کوێرەکان سەبارەت بە بوون و بوونەوەران دەکاتەوە و، زانستەکانی وەك فیزیا و کیمیا و فیزیای گەردوونی و زیندەوەرزانی نهێنیی

گشت کون و قوژبنێکی گەردوون ئاشکرا دەکەن و، هەموو کێشەکانی سروشت چارەسەر دەکەن. کەچی دوای تێپەڕبوونی ئەم هەموو ساڵە، نەك ئەو شتانەی خەیاڵ دەکران نەهاتنە دی، بەڵکو چەندین پێشهات ڕوویاندا کە پێچەوانەی گومان و پێشبینییەکان دەرچوون. سەرهەڵدان و پەرەسەندنی "شەپۆلی میکانیکی" و "فیزیای ناوکی" لەدوای ماکس پلانك[1]، گومانی ئەوانەی تارومار کرد کە لایان وابوو گەڕان بەدوای هەموو شتێك لە ماددەدا و سەیرکردنی بوونەوەران لە پشتی شووشەیەکی لێڵەوە، زانستە.. وە ئەو ڕاستییەی دەرخست کە دەگونجێت لەپاڵ دنیای بینراودا چەندین دنیای نەبینراوی تر هەبن. ئیدی ئەمڕۆ فانۆسی شکاوی کات-شوێن-ماددە-وزە، شتانی جیاوازتر بە گوێماندا دەدەن وەك لەوانەی پێشتر خوومان پێوە گرتبوو.. وەك بڵێی ناچارمان دەکات بۆ هێنانی تێگەیشتنی نوێ و ڕوونکردنەوەی نوێ و ڕاڤەی نوێ. ئیدی با ئەو بەناو ڕۆشنبیرانەمان کە ساڵانێکە دەستیان گرتووە بەسەر دامەزراوەکانی زانستدا و لەڕاستیدا بەدەم خەوەوە دەڕۆن، هەر قەوانی کۆنی نیو سەدە پێشتر بڵێنەوە، وەلێ دنیا نزیکە لە گۆڕانی ڕیشەیی و سکپڕە بە پێکهاتنی تازە و نوێ. ئەو حەتمییەتەی[2] کە لە ڕۆژی لەدایکبوونیەوە بە بەردەوامی لە دەوری گەرداوەکانی مەرگ، گومان و دوودڵی هەڵدەمژێت، ئەوەتا لەنێو باوەشی زریانە شوومەکانداداوایین قسەکانی خۆی دەکات..

---

١. ماکس پلانك (١٨٥٨-١٩٤٧) زانایەکی ئەڵمانی بواری فیزیایە و یەکێکە لە زانا باوەڕدارەکان. بیروبۆچوونەکانی سەبارەت بە فیزیای ناوەکی وەکو شۆڕشێك وابوو لە بواری خۆیدا و دیدی مرۆڤیان گۆری سەبارەت بە جیهانی ناوەکی ماددە و بەدیهاتنی گەردوون.

٢. Determinism

مادديیەتیش[1] کە هەر لە سەرەتاوە بە کەمئەندامی لەدایك بووە، پاش ئەوەی باوکی حاشای لێ کرد، دایکی لە شاڵێکەوە پێچای و، لە حەوشەی کڵێسایەکدا جێی هێشت، ئەوەتا بەهۆی نادیاریی ڕەگەزەکەیەوە لارەمل و کزۆڵە.. خۆی لە خۆیدا کۆمیونیزمیش لەمێژە ستوونە ئاسمانییە درۆیینەکانی ڕماون و ئەوانەش کە لەژێر ڕۆشناییەکەیدا ڕاڤەی ژیانیان دەکرد دەمێکە لافاوەکانی دۆڕان لەگەڵ خۆیدا بردوونی...

بەڵێ، لە لایەك ئەم درۆ مێژووییانە یەك لە دوای یەك بە یارمەتی تەفسیری زەمانە دەگەن بە ڕاڤەی ڕاستەقینەی خۆیان و، لە لایەکی تریشەوە پێشهاتەکانی بواری مێتافیزیك و مێتاسایکۆلۆجی، هێندە پاڵیان بە سنوورەکانی پێنج هەستە ماددییەکەوە نا، تا چەندین کونیان تێ کرد و، لە ئەنجامدا ئاسۆی نوێیان لە جیهانی بیرکردنەوەدا کردەوە. لە سەدەکانی ناوەڕاستدا بەشێك لەم دنیایە هیچ ئاوڕێکی بەلای بوونەوەر و ڕووداوەکاندا نەدەدایەوە و لەبری خانەی زانست و عیرفان، چەند خورا فەتگایەکی بنیات نابوو کە سەرقاڵی سیحر و جادوو و فاڵ گرتنەوە بوو، لەبەر ئەوە نەیتوانی ڕووبەڕووی سەردەمەکانی دواتر ببێتەوە و ڕووخا.. ئەم سەدەیەی دواییش چونکە هەموو جۆرە پەیوەندییەکی لەگەڵ ئاسمان و ئەودیویدا بچڕی و لکاوە بە زەوییەوە، هەتا ئێستا خێری لە خۆی نەدیوە.. ئەمێستا لەناو گەرداوی دژیەکییەکانی خۆیدایە و وەك بڵێی کەوتووەتە داوی کونە ڕەشەکانەوە.[2]

---

١. Materialism

٢. کونە ڕەشەکان (Black holes) بەو شوێنانە دەوترێت لە گەردووندا کە هێزی کێشکردنیان ئەوەندە زۆرە هیچ ماددە و تیشکێکی کارۆموگناتیسی دەوروبەریان ڕزگاریان نابێت و هەموویان هەڵدەمژێت!

بەڵێ، مرۆڤی ماددی ئەم ڕۆژگارە کە تەمەنی خۆی بۆ ڕوونکردنەوە و ڕاڤە کردنی سروشت تەرخان کردووە، هەروەك گرنگی نەدا بە ناوەرۆك و مانای خۆی، بە هەمان شێوە لە پەیوەندییەکانیشیدا لەگەڵ بەدیهێنەریدا بە کاڵ و کرچی مایەوە و بە تەواوەتی تەسلیمی سروشت و بوونەوەر و یارییەکانی ژێری بوو، لەبەر ئەوە داخڵی "بازنەی زیانبەخشەکان" بوو. ئەوەی مایەی نیگەرانییە ئەوەیە کاتێك بە یارمەتی زانست و تەکنەلۆجیا تەقینەوەی گشتی لەسەر ئاستی چینەکانی کۆمەڵگای مرۆیی ڕوویاندا و، ململانێ سەختەکان لەپێناو سوود و بەرژەوەندیدا بەوپەڕی توندی هەڵگیرسان و، لەم سەردەمە خوێناوییەشدا کە خوێنڕێژی وەك شتێکی ئاسایی لێ هاتووە، خوێندەوارە هەژارەکانی ناو ئێمە نابینایانە شەیدای ڕۆژئاوا بووبوون! کاتێك ئەمان لە بنارەکانی ڕۆژئاوادا بەدوای ئەم "خۆشەویستە نادیار"ەدا وێڵ بوون، کەسانی وەك بێرگسن و و بوترو و هاملن و زۆرێکی تریش کە ڕۆژئاوایان بەو ڕۆحە ترسناکەیەوە ناسیبوو، ئاشکرایان دەکرد کە زانست و تەکنیك ناتوانێت هەموو بابەتێك چارەسەر بکات و، دەیانخستنە ژێر پرسیار و، هەوڵیان دەدا خەڵکی لە تابۆکانی مۆدێرنیتە ئاگادار بکەنەوە. بێداربوونەوەیەکی لەم شێوەیە لەناو ئێمەدا، بەتایبەت کە هەموو چین و توێژەکان بگرێتەوە، تەمەنی بیست و پێنج ساڵ دەبێت و نابێت.

بەڵێ، لای ئێمەش، ئەگەر چی درەنگیش بێت، گۆڕانێکی خێرا ڕوویدا، لە ئەزموونگەریی[1] سەیروسەمەرەو، بتی پۆزیتیڤیزم[2] و، عەقڵگەریی[3] سەیرەوە

---

١. Empiricism

٢. Positivism

٣. Rationalism

بەرەو عەشق و ژیانی دڵ و، لە پابەندیی بە سروشتەوە بەرەو ڕۆحانییەت. گەیشتنی ئەم گۆڕانەش بە دوا ئامانجی خۆی، بە سەرکەوتنی ئەو باوەڕدارانە دێتە دی کە ئیمانیان بە خوا و ڕۆژی دوایی و جیهانی ئەودیوی مادده هەیە بەسەر ماددەپەرستان و سروشتپەرستاندا.. ئەم سەرکەوتنە لە هەمان کاتدا یەکێك دەبێت لەو بردنەوە مەزنانەی کە چارەنووسی شوومی ئیمانداران کە ساڵەهای ساڵە ستەملێکراو و ژێردەستەن، دەگۆڕێت.

نزیکەی چارەکە سەدەیەکە نەوەی ئێمە لە هەموو جێگایەکدا و لەژێر شنەبای ئەم سەرکەوتنەدا شایەتحاڵی ڕووخان و دۆڕانی سروشتپەرستی و ماددییەتی زانستی[1] دەبێت و، بە یارمەتیی ئەزموون و دۆزینەوە زانستییە نوێیەکان، ئەو عەقڵگەرابییە سەرشێت و، ئەو زانستگەرابییەی کە لافی شوێن گرتنەوەی هەموو شتێکی لێ دەدا و، ماوەیەکی دوور و درێژ دەخوازرا لە شوێنی ڕۆح و ڕۆحانییەت و مێتافیزیك و دەروونناسی دابنرێن، سنوورێك بۆ لاف و گەزافەکانیان دانرا و زنجیر درا لە زاریان.

بەڵام بەدرێژایی سەردەمەکان هەردەم کۆمەڵانێك هەبوون کە ئەم زانستگەرابییە هاروهاج و ئەم عەقڵگەرابییە بێعەقڵەیان وەرگرتووە و وەك خوایەك مامەڵەیان لەگەڵ کردوون و، هەروەك چۆن لەو ڕۆحانەدا کە لە "نەفسی خراپەکار" پاك بوونەتەوە، هەستیاری و دەمار و لایەنە ناسکەکانی تری مرۆڤ بریکاریی فیرعەونێتیی نەفس دەگرنە ئەستۆ[2]،

---

١. Scientific Materialism

٢. لێرەدا نووسەر ئاماژە بۆ ئەو بۆچوونەی سەعیدی نوورسی دەکات کە پاش پاکبوونەوەی مرۆڤ لە "نەفسی خراپەکار"، چەند لایەنێکی تری مرۆڤ وەك هەستیاری و دەمار و لایەنە ناسکەکانی تر، بریکاری فیرعەونێتی نەفس دەگرنە ئەستۆ! چونکە خوای گەورە بڕیاری داوە جەنگی نێوان خێر و شەڕ لە مرۆڤدا هەتا مردن بەردەوام بێت!

بە هەمان جۆر ئەمانەش وا دەردەکەوێت کە لەژێر وەکالەتی زانست و تەکنەلۆجیادا ماوەیەکی تریش بەردەوامی بە خوایەتی وەهمی و خەیاڵیی خۆیان بدەن. وەلێ بێ هیچ گومانێك ئەمە زۆر ناخایەنێت، چونکە هەنووکە شارستانێتی ڕۆژئاوا کە گەیشتووە بە تەمەنی سەد و پەنجا ساڵی، گۆڕان بەسەر ئەو مانایەدا هاتووە کە بە خۆی بەخشیبوو. ئەوەتا لە نیوەی سەدەی نۆزدەهەمەوە زۆربەی ئەو شتانەی کە بە سنگەخشێ تا ئەم ڕۆژە هاتوون و هەندێك لە شەیدایانی ڕۆژئاوا وەك پێوەری حەقیقەت بۆیان ڕوانیون، پایەی خۆیان لەدەست داوە و، لەبەر چاو کەوتوون و، دانە دانە جێی خۆیان بۆ چەند بەهاگەلێکی تر چۆڵ دەکەن.

ئەمڕۆ نەك تەنها بیریارانی جیهانی ئیسلامی، بەڵکو کەسایەتییە هەڵکەوتووەکانی جیهانی ڕۆژئاواش ڕوو لە خوا و لە ئایین دەکەن و ئەم ڕووتێکردنەش بە داخوازیی سروشتی مرۆیی و بیرکردنەوەی ساغی دەزانن. هەنووکە لەپاڵ شاعیر و فەیلەسووفە ڕۆحگەراکاندا زانایانی سروشت و تەنانەت ماددەپەرست و هەندێك لە کۆنە مارکسییەکانیش لە جیهانی ئەودیو سروشت دەکۆڵنەوە و بەدوای دیدگایەکی نوێدا دەگەڕێن.

خۆزگە دەمانتوانی ئەو پەیامانەی کە لە قورئانەوە دێن، بە هەمان ئاستی خۆی، بەم دڵ و ڕۆحانە بگەیەنین کە بەدوای قورئاندا وێڵن.! بێگومان ئەم پەیامە لەواندا کاریگەریی زایەڵەیەکی مەزنی دەبوو. هەرچەندە دەنگ کزە و، تەمسیل و نوێنەرایەتی هەژارە و، دڵسۆزی لاوازە و، دوژمنانیش بەهێزن و، شانسیش تابڵێی زەبوونە، کەچی لە دوێنێوە هەتا ئەمڕۆ سەدان زانا و بیریار و هونەرمەندانی وەك

فلیپ هیت، ژان پۆڵ ڕۆ، جۆرج بێرنارد، فیۆدۆر دۆستۆیڤسکی، ڕۆدوێی، ئێدوارد مۆنتێل، دیکارت، ڤۆڵتێر، جۆن داڤنپۆڕت، لامارك، پاسکال، گۆستاف لۆ بۆن، ڤیکتۆر هۆگۆ، ڕێنان، لە بەرامبەر هەرێمی شکۆمەند و پایەداری ئەودا سەریان نایە سەر زەوی و لارەمل وەستان. دانپێدانانە سەرسووڕێنەرەکانی ئەم پیاوە ناودارانە سەبارەت بە قورئان و پێغەمبەر، چ زللەیەکی بەسۆیە بۆ ئەو کۆلکە خوێندەوارانەی ئێمە کە نیو سەدە لەمەو پێش یاخیبوونی ڕۆژئاوایان بە بناغە وەرگرت و بێ بیرکردنەوە لەدوایانەوە ڕیزیان بەست!

جگە لە ڕا و بۆچوونی قوتابییە تایبەتەکانی قورئان کە هەر یەکەیان بەڵگەیەکی درەخشانن، گەڕانەوەی بیریارە ناودار و زانا زیرەکەکانی هەر چوار لای دنیا بەرەو بەدیهێنەر و ئایین، نابێت بگەڕێنرێتەوە بۆ حاڵەتی دەروونیی نائومێد و بێچارە و ترسی ئەو بێباوەڕە لاوازانەی هەر کاتێك زۆریان بۆ هات ناڵەی "خوایە گیان!"یان لێ بەرز دەبێتەوە. چونکە هەروەك ناکرێت جیهانی ڕۆژئاوای مۆدێرن بە خۆی و دەستکەوتەکانیەوە بە دنیای بێچارەکان ئەژمار بکرێت، بەهەمان جۆر ناگونجێت ئەو ڕۆشنبیر و ڕووناکبیرانەی ڕۆژئاوا کە دەگەڕێنەوە بۆ ئایین، لەژێر کۆمەڵی سەرسووڕماوان و شۆك بوواندا پۆلێن بکرێن.

هاتنەوە مەیدانی هەست و نەستی ئایینی لەم سەردەمەماندا تەنها لەو ڕاستییەوە سەرچاوەی گرتووە کە مرۆڤ سەرلەنوێ خۆی دۆزیوەتەوە و، پێویستیی بە خوا هەیە و، تێگەیشتووە کە بە بێ خوا نایکرێت و هەڵناکات. واتە دیسان دەنگی ویژدان دەبیسترێت و، نهێنییەکانی پشتی

پەردەی بوون دەردەکەون و، جارێکی تر ڕەحمەتی خوایی لە دڵەکانماندا بە بێ بوونی پەردە و ناوەند خۆی نمایش دەکات.

لە بنەڕەتدا بێباوەڕیی زانایەك و ڕۆشنبیرێکی ڕاستەقینە و بەتایبەت قبووڵ نەکردنی بەدیهێنەر، کارێکە لە تێگەیشتن بەدوورە. چونکە بۆ ئینکاریکردنی زاتی ئولوهییەت مەرجە مرۆڤ زاڵ بێت بەسەر ئەمدیو و ئەودیوی پەردەی بووندا. لەبەر ئەوەی کەسیش ناتوانێت لافی خاوەندارێتیی زانستێکی گشتگیری لەم شێوەیە لێ بدات، ئەوا پێویستە وەك بڕیارێکی بەپەلە و نەفامانە لە ئینکاری بڕوانین. لەم ڕووەوە لە ڕاستیدا قبووڵ نەکردنی خوایەتی، نەك باوەڕ هێنان بە خوا، کارێکە لە سەروو توانا و وزەی مرۆڤەوەیە.

ئای چەند حەزدەکەم شەیدایانی ڕۆژئاوای ناو ئێمەش کە سەدە و نیوێکە هۆشیان لای خۆیان نەماوە، واز لەم سەرشێتییە دوور لە ژیرییە بهێنن و لە حەقیقەت تێبگەن...

# پشت کردن لە زانست و زانیاری

ئەمڕۆ بە ئەندازەی ڕووبەڕووبوونەوەمان لەگەڵ مەترسی و کارەساتەکان، لە هەمان کاتدا خاوەنی هیوا و سەرچاوە و ئامرازی باشین. سەدەکانی نۆزدە و بیست هەم لەڕووی خێر و هەم لەڕووی شەڕەوە یەکێك بوون لە دەوڵەمەندترین و بەپیتترینی سەدەکان. ئەگەر مرۆڤایەتی بیتوانیایە ئەو هەل و فرسەتانەی دەستی کەوتن بە باشی بەکاربهێنێت، دەکرا دنیا بگۆڕرایە بە بەهەشتێك...

بەڵێ، لەمڕۆدا ئاسمان و زەوی شان بە شانی یەك بۆمان پێدەکەنن و، کەشوهەوا و هەلومەرجەکان هەواڵی بەختەوەریی مەزنتر و بەرزترمان پێ دەدەن. زانست و پێشکەوتنیش بە سەرجەم بەروبوومەکانیەوە چووەتە خزمەتی مرۆڤایەتییەوە. بەڵام ئێمە هێشتا وەك پێویست ناتوانین سوود لەم بەروبوومە فراوانانە وەربگرین. لەبەرئەوەی هەتا ئەمڕۆ کۆمەڵێکی چاکەخواز نەچوونەتە ژێر باری لێپرسراوێتیی ئاڕاستەکردنی مرۆڤایەتی،

بەختەوەریی ئەویان دواخستووە و، هەندێك گومان و نائومێدیشیان سەبارەت بە بەختەوەریی هەمیشەیی ئەو دروست کردووە. پێدەچێت ئەم بارە هەتا ئەو کاتەی لێپرسراوە ڕاستەقینەکان هەست بە ئەرکی سەر شانیان دەکەن بەردەوام بێت...

جاران[١] گوند و شار جۆرێك لە ژیانی تایبەت بە خۆی هەبوو، ژیانێکی بێ پلان کە شیرینی خۆی لە دەست داوە و، قەیرانەکان و نەبوونی مەعنەوییات وەك مردوویەکیان لێ کردووە...نەخۆشییە درمەکان و برسێتی پەیتا پەیتا زللەی خۆیان تێدەسرەواند و، ئەو شتانەش کە ئەخلاقی ئەویان زەوت دەکرد هەڵیاندەوەشاند و، لەم نزمی بۆ ئەو نزمی ڕاپێچیان دەکرد. کۆمەڵگاش لە بەرامبەردا بەبێ جووڵەیەك و هەڵچوونێك و وەڵامێك تەنها تەماشای دەکرد و، ئەمەشی بە ژیان ئەژمار دەکرد. بەڵام ئەمڕۆ بە بێگومانی دەرکەوت ژیان لەگەڵ چەند بیر و بۆچوونێکی کۆندا کە هیچ پەیوەندییەکیان بە ڕاستییەوە نییە، ئەستەم و مەحاڵە... "حاڵی جاران مەحاڵە، سا یان حاڵی نوێ، یان توانەوە و لەناوچوون." یان ژیانمان سەرلەنوێ لە سایەی زانستدا دادەڕێژینەوە و نەخشەسازی بۆ دەکەین، یان خۆمان و دنیاکەمان دەکەوینە کەندەڵانێکەوە...

هەندێك باوەڕیان وایە کە بەڕێوەبردنی دنیا لە ڕێگەی زانستەوە، دەبێت بە هۆکاری چەند کارەساتێکی وەك بەئامێربوونی مرۆڤ و گۆڕان بۆ کۆمەڵگەی مێروولەکان. ئەمە هەرگیز ڕاست نییە. هەروەك ڕابردوو بە بێ زانست نابێت، خەیاڵ کردنی ئاییندەش بە بێ زانست

١. پێیان وایە نووسەر مەبەستی کۆتایی سەدەی نۆزدە و سەرەتای سەدەی بیستەمە.

ئەستەمە. هەموو شتێك لە دەرەنجامدا وابەستەی زانستە. وە ئەگەر ئەو نەبێت، دنیا شتێکی تری پێ نییە بیبەخشێت بە مرۆڤ.

بەڵام ئەوەش ڕاستییە کە لە زۆرێك لە شارەکانماندا مرۆڤەکان وەك ئامێریان لێ هاتووە و، هەستە مرۆییەکانیان لەناوبراون و، هاوشانی بیرکردنەوە، لەشساغی و، لەگەڵ ئەویش فەزیلەتی مرۆیی سڕاوەتەوە. بەڵام بەستنەوەی ئەمە بە زانست و زانیارییەوە ناحەقییە. بەڵکو پێویستە لەمەدا ئەوە دەستنیشان بکرێت کە تاوانبارانی سەرەکی و ڕاستەقینە ئەو زانایانەن کە خۆیان دەدزنەوە لە لێپرسراوێتی. ئەگەر ئەو زانایانەی کە نەگەیشتوون بە ئاستی هەست و شعووری لێپرسراوێتی، ئەوەی لێیان چاوەڕێ دەکرێت جێبەجێیان بکردایە، لەوانەیە ئەمێستا زۆرێك لەم بابەتە ناخۆش و مەترسیدارانە بوونیان نەبووایە..!

زانست واتە هەست کردن و تێگەیشتن و پەی بردن لە مەبەستە مەزنەکانی بەدیهێنەر لەو شتانەدا کە بوونەوەر و ڕووداوەکان بۆمان دەگێڕنەوە و، ئەو شتانەش کە فەرمانە تەکوینییەکان بۆمانی هەڵدەڕێژن. مرۆڤ کە لە پێگەی بەڕێوەبەری بوونەوەراندا بەدیهێنراوە، بێگومان دەبینێت و، دەخوێنێتەوە و، هەست دەکات و، فێردەبێت. پاش فێربوون بەدوای ئەو ڕێگایانەدا دەگەڕێت کە زاڵی دەکەن بەسەر ڕووداوەکاندا و ژێرباریان دەخەن. ئەم خاڵە، بە فەرمانی خوا، خاڵی تەسلیم بوون و مەحکووم بوونی بوونەوەرانە بۆ مرۆڤ و، هیی مرۆڤیشە بۆ بەدیهێنەرەکەی.

زانست بە فیزیا و کیمیا و گەردووناسی و پزیشکیی و لقە

هەمەجۆرەکانیەوە لە خزمەتی مرۆڤایەتیدایە و، هەموو ڕۆژێکیش دیاریی نوێی پێ دەبەخشێت.

بەڵێ، زانست و زانیاری لە خزمەتی مرۆڤدایە و، بۆ ترسان لێیشی، هیچ هۆکارێکی جددی بەدەستەوە نییە. مەترسی لە زانستیی بوون و دامەزراندنی زانستییانەی دنیادا نییە، بەڵکو مەترسی لە نەزانین و بێ شعووری و خۆدزینەوەدایە لە هەستی لێپرساوێتی.

لەوانەیە هەندێك جار چەند کاروبارێکی زانستییانە و پلان بۆ دارێژراو ئەنجامی خراپی لێ بکەوێتەوە. قسەیەکمان لەسەر ئەمە نییە. بەڵام بە دڵنیاییەوە نەزانی و بێ پلانی هەمیشە ئەنجامی خراپ بەرهەم دەهێنێت.

لەبەر ئەوە پێویستە لەبری دوژمنایەتی کردنی زانست و زانیاری، ئاراستە بکرێت و بەختەوەریی مرۆڤ بکرێت بە ئامانجی. هەنووکە گرنگترین بابەتی ئادەمیزاد ئەمەیە. ئەگینا هەرگیز لە تواناادا نییە بەر لە سەدەی بۆشایی ئاسمان و پێشکەوتنە زانستییەکان بگرین و، بۆمبی ئەتۆمی و هایدرۆجینی لە مێشکی مرۆڤدا بسڕینەوە.

کەوایە تەنها یەك ڕێگەمان لەبەردەمدایە: ئەویش لێ سەندنی زانست و بەرهەمەکانی زانستە لە کەسانی نەشیاو -کە لە دەستی ئەمانەدا شێوەی چەکێکی کوشندەی وەرگرتووە- و سپاردنیەتی بە کەسانی شیاو و، دامەزراندنی جیهانێکە کە بەختەوەریی دنیا و ئاخیرەتی مرۆڤ ئامانجی بێت. ئەگینا جوێندان بە "ئامێر" و "نەفرەت کردن لە "کارگە" هیچ

سوودێکمان پێناگەیەنێت. تازە ئامێر هەر ئیش دەکات و کارگەش هەر بەردەوام دەبێت. هەروەها شتێکی سروشتییە کە هەتا پاڵەوانانی حەقیقەت- ئەوانەی کە دڵ و مێشکیان دەستلەملانی یەکترن- واز لە ترس و زوێربوون لە زانست دەهێنن و، تێکەڵاوی بوونەوەر و ڕووداوەکان دەبن، زانست و بەروبوومەکانی بەردەوام دەبن لە زیان گەیاندن بە مرۆڤایەتی.

هەر بۆیە نابێت لە زانست و بەروبوومەکانی بترسین. ئەم ترسە هەموو جۆرە چالاکییەك ئیفلیج دەکات. لەڕاستیدا ئەو شتەی کە پێویستە لێی بترسین ئەوەیە کە داخۆ لە دەستی کێدایە. زانست لە دەستی 'کەمینە"یەکی نابەرپرسدا کارەساتە و، سەروو زیادی گۆڕانی دنیایە بە دۆزەخ. ئەنیشتاین تەنها ئەو کاتە هەستی کرد کە ئەتۆمی داوەتە دەست جانەوەرێك، کاتێك خۆڵەمێشی هیرۆشیما و ناکازاکی بینی و، بەدەم گریانەوە داوای لێبووردنی لە زانایەکی ژاپۆنیی هاوڕێی کرد. چ درەنگ کەوتنێکە...!

بەڵام ئەمە نە یەکەمین و نە دواهەمین کارەساتە. لە دەستی بیر و بۆچوونی دڕندەدا هەمیشە دەریاکان زەلکاو و، ڕووبارەکان جۆگەلەی قیر و، کەشوهەواش سەربانێکی چڵکنە! ئەمە هەر وا بووە و هەر واش دەبێت...

مرۆڤایەتی لە چەکی دەستی فریشتەکان زیانی بەرنەکەوتووە. ئەو، زیانی لە ڕۆحە جانەوەرئاساکان و، هەڵپەی تێرنەخۆر و، ئەوانەوە بینیوە کە "حەق" لە "هێز"دا دەبینن. لەمەولاش هەتا ئەو کاتەی ئیمان و زانست تێکەڵاوی یەکتر دەکات و دنیای خۆی دادەمەزرێنێت، هەر بەم شێوەیە بەردەوام دەبێت.

بە هیوای ئەوەی مرۆڤی ئێمەش لەو دنیایە تێبگات کە تیایدا دەژی...

# ڕابەر

ئەم دنیا موبارەکەی کە لە ڕابردوودا و ماوەی زیاتر لە هەزار ساڵ هەمیشە شکۆمەندانە ژیاوە و هەردەم کراوە بووە بەڕووی جوانییەکاندا، ئەوە بۆ یەك دوو سەدە دەچێت لە قەیرانێك بۆ دانەیەکی تر تلۆر دەبێتەوە و، بە دەست ئەو ئاژاوانەی کە سەرجەم لایەنەکانی ڕۆحیان تەنیوە، دەناڵێنێت. قەیرانی دوورکەوتنەوە لە ناوەرۆکی خود.. قەیرانی گۆڕانی سروشت.. قەیرانی ئینکاری کردن و سووکایەتی کردن بە بەها نەتەوەیی و دینی و مێژووییەکان.. قەیرانی نەبوونی مرۆڤی هاوسەنگ و دەستەی بەڕێوەبەر و ڕابەر، ئەوەی جاران پێی دەوترا "قاتوقڕی پیاو"...

نازانم داخۆ ئەم دنیا تێکەڵ و پێکەڵە لە ڕابردووی نزیك و حاڵی حازریدا ڕابەرێکی ڕاستەقینەی بەخۆوە دیوە یان نا، بەڵام دڵنیام لەوەی کە لە دنیای ئێمەدا ڕابەرێکی لەم جۆرە بوونی نییە.

بەڵێ، لەبری ئەو ئیرادە بەهێز و سنگە پۆڵایین و زایەڵە ئاسنینەی

کە سەردەمانێك هەر لە مەڕاکیشەوە هەتا پێدەشتەکانی ئاسیای ناوەڕاست و لەوێشەوە بۆ ناوجەرگەی ئەورووپا خۆی نمایان دەکرد، ئەمێستا مێشوولەکان تیایدا دێن و دەچن.. بەڵێ، ئەم هەرێمە چارەڕەشەی کە تیایدا گوڵەستێرەکان بوون بە ئەستێرە و، مێشوولەکانیش جێگای هەڵۆکانیان گرتووەتەوە، بێشەی شێران دەناڵێنێت بەدەست کەش و فشی ڕێوییەوە و، هێلانەکانی بولبول پەرێشانن بەدەست قەلەباچکەکانەوە و، شەمشەمەکوێرەکانیش لە هەموو لایەکدا ئاهەنگ ساز دەکەن...

لەمێژە سولەیمان کۆچی کردووە و ڕۆیشتووە و، لە جێگای فەرمانڕەوایەتییە بەشان و شکۆکەشیدا شەیتانەکان شەترەنج دەکەن.. لەم ڕۆژانەدا کە تاسە و حەسرەتی ڕۆح و ئیرادە و جوامێریی دەکەین، چونکە چینەکانی کۆمەڵگا تا ئێستا سەدان جار کەوتوونەتە داوەوە، لە ترسی گیرۆدەبوون بە دانەیەکی ترەوە، ترنجاونەتە قوژبنێکەوە و، خەون بە ڕۆژانێکی دەراساوە دەبینن کە تیایدا کاراکتەرە دەراساکان نائومێدییان دەڕەوێننەوە. لەم تەنیاییە ڕەش و ئەنگوستەچاوەدا هەمووان دیلی تاریکییەکانن. شوێنکەوتە نەزانە و ڕێگا نازانێت و بێناگایە لە ژیانی شەرەفمەندانە و سەربەرزانە.. هێزە دەسەڵاتدارەکانیش ویژدانیان نییە و دوای چێژ کەوتوون.. ئەوانەش کە چاویان بە ڕووناکی کراوەتەوە -خوا هێز و پێز ببەخشێت بە ئیرادەیان- زۆربەیان تا ناوقەدیان لە قوڕدا چەقیوە و سەریشیان لەناو هەورەکاندایە[1]. وەك ئەوەی ئاسمانی فیکریی

---

١. پێدەچێت نووسەر مەبەستی لەوەبێت هەرچەندە ئەم جۆرە کەسانە چاویان بە ڕووناکی کراوەتەوە، بەڵام هەلومەرجەکان نالەبارن و وەك قوڕێك تا ئەژنۆیان هاتووە و نایەڵێت ڕێ بکەن! لە هەمان کاتدا ئەمانە واقیعی نین و لە جیهانی خەون و خەیاڵدا دەژین و سەریان لەناو هەورەکاندایە!

چینەکانی کۆمەڵگە ئاوەژوو بوویێتەوە، کاتێك لە کونی شەمشەمەکوێرەدا دێن و دەچن، خەونی گەشت کردن بەنێو ئەستێرەکاندا دەبینن.

بەکورتی، ئەم دنیا گەورەیە لە دەستی سەرسەرییەکاندایە و لەمسەریەوە بۆ ئەوسەری بە دەردی نەبوونی پێشەوایەکەوە دەناڵێنێت.

ڕابەر، کەسایەتییەکە لەڕووی ناوەڕۆك و تایبەتمەندییە کەسییەکانەوە دەزانێت چۆن هەموو کاتێك دەنگی خۆی بە دڵەکان بگەیەنێت و تیایاندا بژی. ئەو، بە ڕوخساری دەرەوەی کە متمانەبەخشە و، فراوانی تێگەیشتنی و، وردی و ناسکی بۆچوونەکانی و، بەهێزیی دەست نیشان کردنەکانی و، عەشقی فێربوون و، توانا و لێهاتنی فێرکردن و، بە بەهرەی سەرکەوتن لە هەموو ئەو بابەتانەدا کە لە ئەستۆیدایە، هەرچەندە خۆی نایەوێت و داوای ناکات، بەڵام سەرنجەکان بۆ خۆی ڕادەکێشێت و، خۆشویستراو و ڕێزلێگیراوە و، مرۆڤێکی پایەبەرزی وەهایە کە سەدان هەزار کەس ئامادەن لە پێناویدا بمرن.

ڕابەر، لە خواردن و خواردنەوە و، هەستان و دانیشتن و، هەڵسوکەوت و ڕەفتارەکانیدا هەمیشە وریا و هاوسەنگ و متمانەبەخشە. ڕاست بیردەکاتەوە و، ڕاست دەڵێت و، ڕاستی خۆشدەوێت و بێز لە درۆ دەکاتەوە.. دڵی بە هەستی "وەفا" لێ دەدات، چاوەکانی بە "دڵسۆزی" دەکاتەوە و دایدەخات و، هەمیشە متمانە و ئاشتی پەخش دەکات...

ڕابەر، بەرامبەر بەوانەی چواردەوری دەم بەخەندە و، بەڕێز و، جددی و، هەتا بڵێی بەویقارە. ئەوانەی لە دەوروبەریدان هەست بەو

کاڵبوونەوە و لەگەڵ ڕاهاتنە ناکەن کە لە نزیکییەوە سەرچاوە دەگرێت و، ئەوانەش کە دوورن، هەست بە مەحروومییەتی دووری ناکەن. ئەو، لەو کۆمەڵگەیەدا کە لێپرسراوە لێی، هەموو گەورەکان بە باوکی خۆی و گشت منداڵەکانیش بە جگەرگۆشەی خۆی دەزانێت و، چەشنی هەستیاریی دایکە مریشکێك، باوەشی پاراستن و میهرەبانیی خۆی دەکاتەوە بۆ هەرکەسێك پەنای بۆ ببات و، هەموان دەخاتە ژێر باڵی پارێزگاریی خۆیەوە. بازنەی شەفەقەت و گرنگی پێدانی هێندە فراوانە، هەر لە مێروولەی ژێر پێیەکانەوە هەتا باڵندەکانی ئاسمان، بەشی خۆی لەو نەرمونیانییە وەردەگرێت و سوپاسگوزار دەبێت.

ڕابەر، وەزیفەشناس و حەسبی و خەمخۆری کەسانی ترە. لە بابەتی جێبەجێکردنی لێپرسراوێتییەکانیدا، نە سەختیی و ناڕەحەتیی ئەو بەربەستانەی دێنە ڕێی و، نە حەزی حەوانەوە و، نە ئەو چێژی ژیانەش کە لە ئەنجامی خۆشگوزەرانییەوە پەیدا دەبێت، ناتوانن لە ڕێگای خۆی لای بدەن و ئەرکەکانی سەر شانی لەبیر بەرنەوە. بە هیممەتێکی پێغەمبەرانە هەڵدەستێت بە جێبەجێ کردنی لێپرسراوێتییەکانی.. هەمیشە لە دڵەوە و جوامێرانە ڕەفتار دەکات.. پاشان لە بەرامبەر ئەو خزمەتانەوە کە ئەنجامی داون چاوەڕوانی هیچ جۆرە کرێ و دیارییەك ناکات و دەڕوات بەڕێی خۆیەوە.

ڕابەر، بە توانای تێگەیشتنی بەرز و سەبر و خۆڕاگرییەکەی، هەموو کاتێك تاقە پاڵپشت و سەرچاوەی هیوای دەوروبەریەتی. لە دنیای ئەفسووناویی ئەودا دژەکانی وەك بڕیاری خێرا و پێکان، وریایی

و ئازایەتی، سەبر و چاپووکی، لەیەك نزیك دەبنەوە و، تێکەڵی یەك دەبن و، دەبن بە تەواوکەری یەکتر. لەژێر شنەبای ڕووناکی بەخشی فەتانەتدا، ئایندە و ڕووداوەکانی ناوی، وەك ڕووداوەکانی ئێستایان لێ دێت و ڕۆشن دەبنەوە.. لە سایەی ئازایەتی و دامەزراوییەکەیدا، ئەو چیا سەختانەی کە وا دەردەکەون ڕێگەی دەرچوونیان تێدا نەبێت، دەگۆڕێن بە چەند ڕێگایەکی تەخت و فراوان. لە بەرامبەر خۆڕاگری و بەردەوامییەکەشیدا، مەحاڵەکان دەبن بە تۆزی بەر با..

ڕابەر، قارەمانی بواری ئەخلاق و فەزیلەتە. بە نەرمی و بەزەیی و میهرەبانییەکەی وەك دڵ و نەبزی لێدەری هەموو زیندەوەران وایە و، بە ئازایەتی و پاڵەوانێتییەکەشی پارێزەری نەبەردی نەتەوە و وڵاتەکەیەتی، دنیای دڵ و گیانیشی ئەمینترین پەناگەی لاوازانە و، بە خاکێتی و خۆبەکەمزانینەکەشی تاقە سەرچاوەی دڵنەوایی هەموو ئەوانەیە کە لەم دەرگا بۆ ئەو دەرگا دەرکراون، هەروەها بە چاوپۆشی و لێبووردنەکەشی چرای ئومێدی ئەوانەیە کە هەڵخلیسکاون و کەوتوونەتە داوی گوناهەوە.

ڕابەر، کاتێك دادپەروەرە خاوەنی بەزەییە و، کاتێکیش هەستی بەزەیی دەجۆشێت ڕاسترەو و دامەزراوە. لە کاتێکدا کە مرۆڤ و بۆچوونە مرۆییەکان لە باوەش دەگرێت، گرتنی کونی مار و مێرووەکانیش فەرامۆش ناکات.. لە جیهانی ئەودا نە دەنگی ئاهەنگ و شایی ستەمکاران و، نە ناڵە و هاواری ستەملێکراوان دەبیسترێت. ئەو، کاتێك بە دیوێکی شمشێرە تیژەکەی ملی کۆبراکان دەپەڕێنێت، بە دیوەکەی تر هونەری دروست کردنی هێلانە بۆ بولبولەکان وەکو وانەیەك دەڵێتەوە.

ڕابەر، بریتییە لە تێکەڵەیەکی سەرسووڕهێنەر و، بە ئەندازەی چیای "ئاگری" خاوەنی شکۆیە و، بەقەدەر دەریاچەی "لوط"یش بە سامە. ئەوانەی کە تەنها لە ڕووی شان و شکۆیەوە تەماشای دەکەن، هەست دەکەن لە بەرامبەر لوتکەیەکدان کە دەست پێی ناگات و، دووچاری سەرسووڕمان دەبن.. ئەوانەش کە لە ڕووی ئیخلاس و دڵسۆزی و پەیوەندیی لەگەڵ ئاخیرەتدا دەیناسن، وا دەزانن کە ئەژنۆیان ناوە بە ئەژنۆی یەکێك لە ڕۆحانییەکانەوە و لە هۆشی خۆیان دەچن.

چەندینساڵی دوور و درێژە ئەم وڵاتە پیرۆزە بە دار و بەرد و، گیاندار و بێگیان و، باوەڕدار و بێباوەڕیەوە بە حەسرەتەوە ناڵاندی و چاوی لە ڕێی ڕابەرێکی لەم شێوەیە بوو.

لەم پێناوەدا سەدان جار مۆمە درۆیینەکانی بە خۆر زانی و چەپڵەی بۆ لێ دان.. سەدان جاریش گوڵەستێرەکان بە ئەستێرە تێگەیشت و شوێنیان کەوت.. وە نازانم داخۆ چەند جاریش جەردە و ڕێگرەکان بە ڕێبوارانی ڕێی حەج تێگەیشت و تێکەڵاویان بوو. وا پێدەچێت ئەم گەڕانە پڕ لە هیجرانە ماوەیەکی تریش بەردەوام بێت.

# هەناسەکانی دڵ

هەناسەکانی دڵ بێ پیت و بێ وشەیە، بەڵام لە هەمان کاتدا کاریگەرترین و سەرسوورهێنەرترینی مۆسیقاکان لەوانەوە دەبیستین. هەناسەکانی دڵ شێوەزارەکەی هێندە بەتام و شیرینە، زۆر لە سەروو ئاستی هەموو ئەو دەربڕینانەوەیە کە هێشتا نەکەوتوونەتە سەر زوبانەکان و، نەگەیشتوون بە گوێیەکان و، نووکی قەڵەم و قاڵبی پیتی چاپخانەکانیان نەناسیوە. ئەوانەی خاوەنی ئەمەن، ئیدی نە هەست بە پێویستیی نووسینی شتانی تر دەکەن و، ئەوانەش کە لە زمانی ئەو تێدەگەن، چیتر بەدوای دەربڕینێکی کاریگەرتردا ناگەڕێن. ئەگەر ئەو ئەدیب و نووسەرانەی کە دەیانەوێت بەهۆی ڕەوانبێژی و ڕەوانیی زوبانەوە خۆیان دەرببڕن و، ئەو شەلاتییانەی ڕەوانبێژیش کە بە مەبەستی دروست کردنی کاریگەری لەسەر خەڵکی لەم فێڵی زمان بۆ ئەو تەڵەکەی دەربڕین ڕادەکەن، ئەگەر ئەمانە ئەو ئەفسوونە هەرە قووڵەی هەناسەکانی دڵیان بناسیبایە، لەبری ئەوەی لەم ڕێگا هەوراز و نشێو و پڕ لە مەترسییانەدا تەمەنی

خۆیان بەفیڕۆ بدەن، ڕوویان لە سینەی خۆیان دەکرد و، تێدەکۆشان بە مزراب‌ەکانی بیرکردنەوە، نەغمەکانی دڵیان بخەنە گۆ.

بەڵام چی لە دەستی مرۆڤ دێت؟ ڕۆژگارەکەمان سەردەمی ژاوەژاوە و مرۆڤەکانی ناویشی هەوڵ دەدەن بە هەمان زمان خۆیان دەرببڕن. بەڵێ، ئەمڕۆ دنیا لەمسەر بۆ ئەوسەر بەدەست نالەبارترینی دەنگە نەشازەکانەوە گیرۆدەیە و دەناڵێنێت. ئەو شتانەی پێیان دەڵێین کارە دەراساکانی شارستانێتی وەك سەیارە و، شەمەندەفەر و، میترۆ و، گرێدەر و، بلدۆزەر و، کەشتی و، فڕۆکە و، ڕادیۆ و تەلەفزیۆنەکان... کەشوهەوامان پیس دەکەن و ئاسوودەیی و ئارامیمان پارچە پارچە دەکەن. تا وای لێ هات ئێمەشیان وەك خۆیان لێ کرد. ئەمڕۆ زۆربەمان زمانمان لە پێش دڵمانەوەیە و، پێشی ئامێر و مەکینەکانمان داوەتەوە و، وەك بڵێی ئێمەش دەمانەوێت بەشداربین لەو ژاوەژاوە گشتییەدا. سەرلەبەری وڵات وەك ئەوەی وڵاتی کەڕان بێت، پیاو ئەو پیاوەیە بقیڕێنێت.. لە دۆخێکداین وەك بڵێی دەمانەوێت بە دەنگ و هاوارمان کەسانێك خەفە بکەین و دەنگیان نەهێڵین. نە ڕێزی بیر و بۆچوون ماوە و، نە حورمەتی هەست و نەستی مرۆیی. ئەو کەسانەی بتوانن بەهۆی یاری کردن بە وشەکانەوە لە مەیدانێکی فراواندا دەنگە دەنگ و ژاوەژاوێکی زۆر بنێنەوە، بە سەرکەوتوو دادەنرێن و خەڵات دەکرێن. ئیتر حەز دەکات ئەوەی دەیڵێن و دەیهۆننەوە هیچ سوود و بەرژەوەندییەکی تێدا نەبێت و، پەیڕەوی هیچ جۆرە یاسایەکی لۆجیکیش نەبێت، ئەگەر بە هەر شێوەیەك بێت دەنگ دەربکات و خەڵکانی بێئاگا بخاتە جووڵە، ئیدی ئیش تەواوە...

سەردەمانێك سروشتیترین حاڵەتی ئێمە و کەشوهەوای هەمیشەییمان بێدەنگی بوو. لەوانەیە زۆرێك هەستیان بەم هەرێمی ئارامی و ئەم مۆسیقای بێدەنگییە نەکردبێت، هەروەك چۆن ئێستاش هەست بەم هەموو هات و هاوارە ناکەن. ئەو کاتانە لەم هەرێمی بێدەنگییەدا سروشتیترین دەنگەکان دەبیسترا و، وەك مۆسیقایەك و وەك شیعرێك گوێی بۆ دەگیرا. ئەم حاڵەتە هەموو ڕۆژێك مرۆڤەکانی بەو دەنگە سروشتییانە چەند جارێك دەشت، بەجۆرێك تێکەڵاوی ڕۆحیان دەبوو، هەرگیز لە هەرێمی ئەواندا پیسبوون بە ژاوەژاو ڕووی نەدەدا و، هیچ کەسێکیش هانای بۆ هات و هاوار نەدەبرد. گشت جێگایەك لێوانلێو بوو لە ئارامی و، هەموانیش بێدەنگییان هەڵدەمژی. لە هەرێمی ئەواندا بێدەنگییەکی ئاوێتەی ڕێز و ڕەوشت فەرمانڕەوا بوو، بە شێوەیەك ئەگەر کەسێك تەنها یەك جار پێی نابێتەوە ئەم هەرێمەوە و، یەك دوو دڵۆپ بێدەنگی چەشتبێت، ئیدی هەرگیز بیری لە جێهێشتنی نەدەکردەوە.

خەڵکانی ئەو کاتە هێشتا کارە دەراساکانی شارستانی نوێیان نەناسیبوو و، بێئاگابوون لە تواناکانی ئەم بوونەوەرە زۆربلێیانە، هەر بۆیە هەموو لایەك بێدەنگ و خامۆش بوو. حاڵی ئەوانیش ڕێك پڕاوپڕی ئەم هەوا گشتییە بوو. بە هەر شوێنێکدا تێدەپەڕین قومیان لە بێدەنگی و ئارامییەکی سپی وەکو شیر دەدا و، دەگەیشتن بە هەر کەسێکیش هێما و ئاماژەی بێدەنگییان لێ وەردەگرت. بەختەوەرانی ئەو سەردەمە کە ژیانێکی ئاخیرەتی دەژیان و داخراو بوون بەڕووی هەموو جۆرەکانی نەگونجاوی و نالەباریدا، هەمیشە و بە شێوەی جیا و ئەدای جیا و هەوای جیا، بێدەنگی و ئارامییەکی وایان نیشان دەدا، هەرگیز ئەو

ژاوەژاوە دەرەکییانەی کە بە دەگمەن لێرە و لەوێ ڕوویاندەدا، نەیاندەتوانی ئاهەنگی ئەم هۆنراوەی بێدەنگییە بشێوێنن.

ئەم مرۆڤانە جاروبار کاتێك پێویستی دەکرد دەهاتنە گۆ، وەلێ ئەمە زیاتر بۆ ڕوونکردنەوەی ئەو مانایانە بوو کە لە کردار و ڕەفتارەکانیان دەچۆڕا و، بە ئاڕاستەی دەرخستنی هەستە تەماوییەکان و، ئاسان کردن و سادە کردنی ئەو حەقیقەتانە بوو کە لای نەزانەکان پەنهانە. زوو زوو زاریان نەدەکردەوە، کاتێکیش دەهاتنە قسە، ئەو نەخشی بیر و هزرەی لە کاتی بێدەنگیدا چنیبوویان، پەخشانیان دەکرد و چەندین گەوهەری حیکمەتیان لە کریستاڵەکانی فیکر پێشکەش بە بیسەران دەکرد.

لەم کەشە پاك و بێگەردەدا نە پزیسکێك دەبینرا کە ئەم هەوا خاوێنە بشێوێنێت و، نە دەنگێکی دڕاو و ژاوەژاوێکی بێجێ دەبیسترا. ئەگەر جاروبار دەنگ و هەناسەیەکی نامۆ و نەشاز دزەی بکردایەتە ئەم هەرێمە پاکەوە، یەکسەر ئەم مرۆڤانە و جیهانە ئەفسووناوییەکەیان وەك ئەوەی بە جادوویەك نوێ ببنەوە، خێرا دەگەڕانەوە سەر حاڵەتی پێشوویان و، چەشنی ئیلهامی فریشتەکان کە لە ئاسمانەوە دادەکات، دەستیان بگەیشتایەتە هەر ڕۆحێك سەرمەستیان دەکرد. ئەو کەسانەی گەیشتبن بە بەختەوەریی ناسینی ئەم جۆرە مرۆڤانە، لەبری "بیستم، گوێم گرت، خوێندم، فێربووم، باوەڕم کرد"، دەڵێن "بینیم، هەستم کرد، پەروازم کرد، منیش بووم بەوە." لە سایەی ئەم سەروەرییەی کە ئاوێتەی قووڵیی حاڵ و دڵی ئەواندا بوو کە خەڵکی زمانی ئەوانی بزانیبایە یاخود نا، هەموان بەوپەڕی ئاسانی لێیان تێدەگەیشتن و حاڵی دەبوون. ئەمە کاتێك

تێکەڵاوی خەڵکی دەبوون.. ئنجا کاتێکیش دەخزانە گۆشەیەکەوە و سەرگەرمی موراقەبەی خۆیان دەبوون، پشکۆیان لە دڵاندا دادەگیرساند و، لە ڕۆحەکانیشدا وەك زایەڵەی شەیپوری ئیسرافیل دەنگی دەدایەوە. بێدەنگیی ئەم مرۆڤە پاك و بێگەردانەی کە هەمیشە لە پەیوەندیدا بوون لەگەڵ خوای گەورەدا، وەك فەرمانێکی کەوتنە جووڵە وایە سەبارەت بەوانەی کە زاری دڵ و ڕۆحیان بەستراوە. کاتێك ئەوان گەنجینە شاراوەکانی نێو سنگیان بە هەڵسوکەوت و ڕەفتارەکانیان ئاشکرا دەکرد، لەبری زوبانێکی بێدەنگ، هەزاران زمانی تر دەهاتنە گۆ و، لە هەموو لایەکەوە ئەو دڵانەی کە ئامادەبوون و لە پێشینە بڕیاریان نەدابوو، گوێیان هەڵدەخست و، جۆش و خرۆشێکی سەرسووڕهێنەر دایدەپۆشین. ئەم بێدەنگییەی ئەوان، مۆسیقایەکی هێندە قووڵ بوو ڕۆحەکانی دەهێنایە جۆش، بەجۆرێك هەموانی دەدایە پێش خۆی و، بەرەو ئەو شوێنەی دەیویست ئاڕاستەی دەکردن و، نەغمەگەلێکی دەدا بە گوێیاندا کە پێشتر نەبیستراوە و، چەندین شتی چاوەڕواننەکراوی پێشکەش دەکردن کە هێشتا ناوی لێ نەنراوە. دەوروبەری ئەم جۆرە کەسانە لەم وتارە بێدەنگانە شتی زۆریان وەردەگرت و، لە ئاسۆی فراوانی ناوەرۆکی جیا و، تێگەیشتنی جیا و، گوتەی جیادا -کە بە قاڵب و شێوازەکانی دەربڕین و ڕەوانبێژی تەسك و بچووك نەبوونەتەوە- گەشتیان دەکرد و، بەگوێرەی پلەی ڕۆحیان هەستیان بە قووڵیی دەکرد.

بەتایبەت لەناو ئەو بێدەنگ و خامۆشانەدا کەسانی وا هەن، ئەگەر خەڵکانێك بتوانن ئەو ڕووناکییەی لە نیگاکانیان دەکەوێتە خوار و، ئەو مانایانەی لە خەت و نیشانەکانی ڕوخساریان دەچۆڕێت و، ئەو قووڵییەی

کە لە هەڵسوکەوتە تەلیسماوییەکانیاندا هەیە، ببینن، گیرۆدەیان دەبن و، نایانەوێت جارێکی تر لێیان جودا ببنەوە. ئەو کەسانەی کە بە هۆنراوەی بێدەنگی پڕبوون و تێربوون، لە سایەی بیر و بۆچوونی ئیمانی و لۆجیکی ئیماندارانەدا، جیاوازتر لە هەموو شتێك دەڕوانن و، فراوانتر لە هەموو شتێك تێدەگەن.

سەبارەت بە شەخسی خۆم، ناتوانم بڵێم لە چوارچێوەی "تێگەیشتن"ی تەواوەتیدا ئەم خامۆشە مەزنانەم ناسیوە. لەبەر ئەوە ناشتوانم بڵێم کە بە ئەندازەی پێویست سوودم لێ بینیون. بەڵام دیسانیش پێویستە دان بەوەدا بنێم کە سەرەڕای هەموو ناتەواوییەکانم وەك وەرگرێك، هەر کاتێك ڕێم لە هەرێمی ئەوان هەڵکەوتبێت، گاهـ مانا داخراو و نهێنییەکان وەك دڵۆپی شەونم تکاونەتەوە ڕۆحمەوە و، گاهـ ئەوەندە نهێنیم بینیوە و چەشتووە، هەرچەندە چەندین ساڵیشی بەسەردا تێپەڕیوە، کەچی هەر کاتێك یادیان بکەمەوە، مووچڕکە بە لەشمدا دێت. سەرەڕای هەموو شتێك وتار و دەربڕینە بێ پیت و، بێ وشە و، بێدەنگەکانی ئەوان، منیان هێندە مەست کردبوو کە تەنانەت ئەمڕۆش هەر کاتێك ئەو سیما درەخشانانەم بیربکەوێتەوە، چاوەکانم پڕدەبن لە فرمێسك و، لە ڕۆحمدا هەست بە مۆسیقای ئەو خامۆشانە دەکەم. پاڵ بە سنووری حەوزی سروشتی خۆمەوە دەنێم و، لە تەنیشت بوونی ئێستامدا، دەکەومە خەون و خولیای ئەو بوونانەی کە لە داهاتوودا دەکرێت بە دەستیان بهێنم.

# نوێژ

نوێژ میعراجی ئیمانداره و، له ڕێگەی میعراجدا ڕووناکی و بوراقیەتی.. پەیك و کەشتی و فڕۆکەی ڕێگای دوور و درێژی دڵانی باوەڕداره.. سەبارەت بە ڕێبواری ڕێی قوربەت و ویساڵ، نزیکترین قەرارگایە لە جیهانەکانی ئەودیوەوه و، دواین خێوەتیەتی و، یەکێکە لەو گەورەترین هۆکارانەی کە هاوسنوور و دراوسێیە لەگەڵ ئامانج و مەبەستدا.

لە ڕۆژی قیامەتدا ڕێگای گەیشتن بە نێوچاوانی سپی و، ڕوانینی ڕۆشن و، گرتنی پێشی پێشەوە بە یارمەتی ئەو نیشانە و هێمایانەی لەو ئەندامانەدا دەردەکەون کە لە سوژدە و دەستنوێژدا بەکارهێنراون و، بوون بە خاوەنی ویژدانێك کە بە ئەندازەی دنیای ناوەوەی دانیشتوانی ئاسمانەکان پاك و بێگەرد بێت.. بەڵێ، ڕێگای گەیشتن بە هەموو ئەمانە، دیسان بەناو نوێژدا تێدەپەڕێت. ئەم عیبادەتی نوێژەی کە بە ناونیشانی نزیك بوون لە خواوه ئەژمار دەکرێت و چەندین قووڵایی

جیاجیای تێدایە، دەکرێت لە هەمان کاتدا وشەی "ڕیبات"ی لە بەرامبەردا بۆ بەکاربهێنرێت، بە واتای وابەستەبوون بە بیر و بۆچوونی بەندایەتییەوە و بەسەربردنی تەمەن لە چوارچێوەی ڕەزامەندی خوادا.

دەستنوێژ -بەنیازین لە داهاتوودا و لە کاتێکی تردا بە شێوەیەکی سەربەخۆ و تایبەت باسی لێوە بکەین- یەکەمین ئاگادارکردنەوە و یەکەم ئامادەکارییە لە ڕێگای نوێژدا، بانگیش -ئەمیش پێویستە سەربەخۆ تاوتوێ بکرێت و مافی تەواوی خۆی پێ بدرێت- دووەم ئاگاداری و ڕێگایەکی گرنگی "هەڵکشانی ڕۆحی و مێتافیزیکی"یە. ئەو مرۆڤەی کە بە دەستنوێژ جەستەی لە شتە ناپاکەکان و ناشرینییە هەست پێکراو و هەست پێنەکراوەکان پاك دەبێتەوە، لەگەڵ بانگدا گوێ بۆ ویژدانی خۆی هەڵدەخات.. لەگەڵ یەکەم نوێژیشدا کە ئەنجامی دەدات، تەقالای دۆزینەوەی سەدا و هەناسەی نێو ناخی خۆی دەدات.. پاشان دەست دەکات بە چاوەڕوانی کردنی دەست پێکردنی ئەو جووڵە و بزووتنەوە مەزنەی کە تەنها دەکرێت لە نوێژی بە کۆمەڵدا بەرجەستە ببێت.

ئەم پەرستشە پیرۆزەی کە چەشنی میعراج فراوانە، وەکو فریشتەکانی چواردەوری عەرش مرۆڤ دەخاتە سووڕانەوەی بەردەوام و، بە ئاسمانەکانی ڕەهاییدا گەشتی پێ دەکات و، دەیگەیەنێت بە جیهانی فریشتەکان، وەك ڕووبارێك وایە کە ڕۆژی پێنج جار خۆمانی پێ دەشۆین و، لە هەر جارێکدا دیسانەوە لە هەڵەکانمان پاکمان دەکاتەوە و، دەمانبات بۆ ناو زەریاکان و، بەردەوام لە نێوان سەرەتا و کۆتادا دەمانگەڕێنێت و، ئەمەش بە واتای ڕاهێنانێك دێت لە دەرەوەی ڕەهەندە سروشتییەکانماندا و،

لە بواری ئاخیرەتی بوون و ئەبەدی بووندا گەشە بە تواناکانمان دەدات.

شەو و ڕۆژ، بەهۆی نوێژەوە دابەشکردنێکی پڕ نهێنییان بەسەردا دێت. کاتەکانی ژیان، بەگوێرەی خولگەی عیبادەت ڕێك دەخرێن.. وە لە سایەی ئەمەدا مامەڵەکانمان لە ژێر چاودێری خوای گەورەدا ئاڕاستەی دروستی خۆیان وەردەگرن. بەم جۆرە ئەو کاروبارانەش کە دەکەونە دەرەوەی سنووری عیبادەت، وەك عیبادەتیان لێ دێت.. ڕەنگ و بۆی پەرستش وەردەگرن.. وە ژیانی فانیی سەر زەویمان ڕەنگی ژیانی دانیشتوانی ئاسمانەکان دەگرێت.

کاتێك لە ناوەڕاستی ژاوەژاوە دنیاییەکان یاخود لە ناوجەرگەی بێدەنگیی گشتیدا، بەهۆی میلی کاژێرەکان و، جێگۆڕینی خۆر و، زۆربوونی دەنگ و سەدا لە چواردەوری مزگەوت و، جۆش و خرۆشی ئەبەدییەت لە هەموو لایەکدا و، پڕۆفەی قورگی بانگبێژەکان و، دەنگی بڵندگۆکانەوە، دەزانرێت کاتی بانگ نزیك بووەتەوە. لەم کاتەدا ورتە ورتی بێدەنگی نێو سینەکان و، وڕێنەی شپرزەی تازە لەخەو هەستاوەکان، وەك ئەوەی لە بەرزەخی نێوان دونیا و ئاخیرەتدا بژین، لەم کاتەدا دەنگانێك دێنە بیستن کە سنووری ڕەهەندە ماددییەکانمان تێدەپەڕێنن.. لە هەمان کاتدا مانۆڕ و گەڕانی بیرکردنەوەکان بەدوای ڕێڕەوی نوێدا و، پێش ئەوەی بچینە ناو نوێژەوە، تێبینییەکانی سەر ڕێگای چوون بۆ مزگەوت و نوێژ، چەندین هەستی تریش دەخەنە جووڵە.. دونیایەك شت دەدرکێنرێت.. مرۆڤەکان بە مەبەستی کردنی ئەو پەرستشەی کە بڕیارە کەمێکی تر ئەنجام بدرێت، لە دووی تەرکیز و هەڵکشانی مێتافیزیکی دەگەڕێن.. وە کار دەکرێت بۆ ئامادە کردنی سەرجەم ئەزموونە ڕۆحییەکان.

دەکرێت هەریەك لە ڕۆیشتن بەرەو مزگەوت، تێبینییەکانی سەر ڕێگا، یەکەمین هەژان کە بە دەستنوێژ گرتن بەرجەستە دەبێت، بە هەولێك بژمێررێن بۆ گەیشتن بە ئاستی ئامادەگی بۆ نوێژ. بانگ، وەك بانگهێشت کردن وایە بۆ نێو بازنەی حەرەم و، دەنگێکی لەدوننییە کە لە ناو قولاییەکانی ڕۆحماندا ئامادەمان دەکات بۆ تەرکیز و چڕبوونەوە و، وەك مزرابێکە کە بە هەستەکانماندا دەهێنرێت و دەبرێت. گەر لەبەر دووبارەبوونەوەی لە هەموو ڕۆژێکدا، گوێیەکانمان پێی ڕاهاتبن و، ژیریی عەوامانەشمان هەست بە ئولفەت بکات، لەڕاستیدا بانگ هەمیشە وەك مانگێك لە پشتی ئەو تەپۆڵکانەوە کە دەکەونە نێوان ئێمە و ئەبەدییەتەوە، لەناکاو هەڵدێت.. وەك هەورەگرمەیەك هاوار دەکات و، لەپڕێکدا نیگا زەوی نشینەکانمان وەردەچەرخێنێت بەرەو ئاسمان.. وە لەم سەروبەندەدا وەك فوارەیەك کە تاڵی باریکی ئاوی لێ بێتە خوار و، وەك تاڤگەیەك کە بە شکۆوە هاژەی بێت، لە هەموو لایەکدا فەسڵ و ماوەیەکی خوایی دەست پێ دەکات.. هەر ئەوەندەی دەستیشی پێ کرد، خۆشترین و، کاریگەرترین و، سەرنجڕاکێشترین و، ژیانبەخشترین مۆسیقا ڕۆدەکاتە ناو ڕۆحمان. هەر بەمەشەوە ناوەستێ، بەڵکو ئەفسوونی چاخە ڕووناکەکان بە دڵماندا دەچێنێت. کات، بە هێنانەوەی ئەو شتانەی کە لە قۆناغە جیاوازەکانی مێژوودا لەدەستمان داون، جۆش و خرۆشمان پێ دەدات.. وە لە هەموو جارێکیدا گورزەیەك لە دەنگی تازە و، چەپکێك شیعر و، دەستەیەك ئاهەنگمان پێ دەبەخشێت. ئێمە هەردەم بانگ وەك خۆشتنێك بە مۆسیقا تەماشا دەکەین و، بە هەموو بوونمان دەیبیستین و، لە هەر جارێکیشدا کە گوێبیستی دەبین، بە

ئەفسوونێکی نەزانراو، بێداردەبینەوە لە ئاست وەرگرتنی تامێکی تر و، ناسکییەکی تر و، حەزێکی تردا. ئەم هەست و شعووره زۆر جار ئەو هەستەمان پێ دەدات وەك بڵێی بە پلیکانەیەکی ئەفسووناوی بەرەو ئاسمانەکان بەرزببینەوە، یاخود وەك ئەوەی بە باڵۆنێك لە ئاسمانە بەرین و فراوانەکاندا گەشت بکەین. بەتایبەت ئەگەر بانگ، لە چوارچێوەی یاسا و ڕێسا تایبەتەکانی خۆیدا و، لە دڵ و ویژدانی بانگبێژەوە بێتە دەر.. ئای چەند نوورانی و هەست بزوێنە ئەو چەند خولەکەی کە تیایدا ئاسمانەکان سەرشار دەبن لە نوور و، ڕۆحی ڕەوانی موحەممەدی شاباڵ دەگرێت و، لیسانی ئەحمەدی ئاسمانەکان و زەوی دەزرنگێنێتەوە! ئەگەر مرۆڤ لەو چەشنە کاتانەدا بتوانێت ڕۆبچێتە خوارەوە بۆ قوڵترین جێگاکانی ڕۆحی و بتوانێت گوێ لە ویژدانی خۆی ڕابگرێت، ئای هەست بە چ ماناگەلێکی پەنهان دەکات کە ڕژاونەتە ناخیەوە!

ئەو ویژدانە زیندووانەی کە هەموو کات خۆیان نوێ دەکەنەوە و ژیانی دڵ و ڕۆحیان بە تازەیی دەمێنێتەوە، لە هەموو کاتێکی بانگدا، شیرینی و پاراویی یەکەم هاتنەخوارەوەی لە ئاسمانەوە هەست پێدەکەن و، لەنێو ئەو دەنگەدا کە لە منارەکانەوە بەرز دەبێتەوە، گوێ لە بانگهێشتی پێغەمبەران دەگرن.. لە سینەیاندا دەگەن بە تەکبیر و تەهلیل و کۆڕی شایەتیدانی فریشتەکان.. وەك بڵێی هەست بە نەفەسە ژیانبەخشەکانی جوبرەئیل و هەناسە زیندووکەرەوەکانی ئیسرافیل دەکەن.

لەگەڵ بانگدا، دوای ئەوەی هەژان و تێربوونی دەرەوەی نوێژ تەواوبوو، بەڵام هێشتا مرۆڤ نەچووەتە ناو نوێژی فەرزەوە کە بریتییە لە نزیکی و قووڵیی ڕاستەقینە، لە سایەی نوێژی سوننەت و قامەتدا

-که به فهسڵی ههڵکردنی شنهبای ڕهحمهتی خوایی دادهنرێت بهسهر ڕۆحهکاندا- ئهو تهرکیز و چڕبوونهوهیهی که تا ئهو کاته ههنگاو به ههنگاو قووڵتر بووتهوه، دیسانهوه جارێکی تریش تاقیدهکرێتهوه و، وهك ئهوهی بڕیاربێت مرۆڤ بۆ میعراج سهربکهوێت، بهو شێوهیه ئاماده دهبێت بۆ نوێژ. ههموو ئهو دهنگ و وشه و کردارانهی که ههتا ئهم چرکهساته به مهبهستی ئاگادارکردنهوهی لایهنه مرۆییهکانمان و، ئاڕاستهکردنمان بهرهو میحرابی ئهبهدیمان، بهر ڕۆحمان کهوتوون، وهکو کرداری سازکردنی تاڵ و ژێیهکانی ئامێری مۆسیقای ویژدانمان وان به مهبهستی دۆزینهوهی نهغمه ڕاستهقینهکانی ناخمان.. دهنگی ڕاستهقینه له عیبادهتدا ئهو کاته دهست پێ دهکات که کۆمهڵێك مرۆڤ ههست و نهست و بیرکردنهوهیان بووه به یهك و، ڕوویان له میحرابێکی تاقانه کردووه و، له پشتی ئیمامێکهوه ڕیزیان بهستووه و، به چهمانهوه و نووشتانهوهیان ڕێز و ستایش دهردهخهن و، له بهرامبهر خواوه ڕاوهستاون و ئومێدهواری چهندین شتن و، له سوژدهدا سهریان و قاچهکانیان له ههمان ئاستدایه و، بهم شێوهیه ڕووهو خوای گهوره ڕێ دهکهن. ئێمه به ئهندازهی ههست کردنمان به ڕۆحی جهماعهت له ویژدانماندا، تامی جوانی و جۆش و خرۆشی سهردهمی ڕووناکیی پێغهمبهران دهکهین.

بهڵێ، بۆ ئهوانهی که نوێژهکانیان هاوتهریبه به نوێژی دانیشتوانی ئاسمانهکان، ههموو جووڵهیهکی پشت ئیمام، ههموو وتهیهك، وهك دهنگێك وایه که حهسرهتی بهههشتی لهدهستدراو یادی ئادهمیزاد دهخاتهوه و، بۆن و ڕهنگی هیوا و بهیهك شادبوونهوهی لێ دێت. بۆ ههموو ئهو کهسانهی که خۆیان ڕادهستی ڕهههندی میعراجیی نوێژ دهکهن، نوێژ

وەکو تەپۆڵکەکانی بەهەشتی جوان و نازدار وایە لە دەمی سپێدەدا. ئێمە بە ئەندازەی فراوانیی دنیای ناوەوەمان، لە هەر وەستانێکماندا بۆ نوێژ، قوم لە بێگەردیی و ئاسوودەیی ئەو کاروانی ڕووناکییە دەدەین کە لە جوانییەکانی بەهەشتەوە هەتا ئەم ڕۆژگارەمان درێژ بووەتەوە. لە سایەی ئەمەدا زیهنمان لەو پەرتەوازەییە ڕزگاری دەبێت کە بەهۆی جەنجاڵیی دنیاوە تووشی بووە.. ڕۆحمان لە کەشوهەوای تەنگ و تاریکی جیسمانییەت قوتاری دەبێت و، دنیای دڵمان جارێکی تر بە خولیای ویساڵ قوڵپ دەدات. ئەگەر لە هەموو کاتەکانی نوێژدا و لە کاتی سەرجەم فەرزەکانیشدا نەبێت، پاڵەوانانی بواری ڕۆح و دڵ، هیچ نەبێت ڕۆژی چەند جارێك لە نێوان ئەزەل و ئەبەددا دێن و دەچن.. زوو زوو ڕابردوو و داهاتوو پێکەوە بە بێژنگی بیرکردنەوە تەتەڵە دەکەن.. وە پێکەوە و لە یەك کاتدا تەماشای ئەو پارچە ئاڵتوونییانەی کات دەکەن کە وا دەردەکەون ڕابردوو بن، لەگەڵ ئەو تەپۆڵکە زومرڕوتییە سەوزانەی داهاتووش کە ڕەنگ و بۆی هیوایان گرتووە.. ئەو کەسە وەك ئەوەی قوم لە ئاوی کەوسەر بدات، یادگاریی هەزار و یەك چێژ و بەختەوەری لە ناخی خۆیدا دەدۆزێتەوە. وەك ئەوەی لە خەوندا بێت، دوورییەکان و ڕەهەندەکان تێدەپەڕێنێت. لە جیهانەکانی سەروو کاتدا دێت و دەچێت.. تامی هەموو چێژەکانی شتە دەراساکان دەکات.. لەم هەست بۆ ئەو هەست و، لەم بیرکردنەوە بۆ ئەوی دی باڵ دەگرێت.. هەموو ساتێکی، لەنێو زریان و شەپۆلی مەعریفەتێکی جیا و، خۆشەویستییەکی جیا و، چێژێکی جیادا بەسەر دەبات. (ئەم تێبینییانە تایبەتە بەو کەسانەی کە ئاسۆی عیرفانیان گەیشتووەتە ئەم پلەیە.)

بەتایبەت کاتێك ڕۆح و دڵ یەکانگیر دەبن لەگەڵ نوێژدا، ئیدی ئەم چۆنێتییە نوورانییە، لەبری کردارە ئاساییەکانی جارانمان، ئاهەنگ و شیعر و ئاسمانێتیی خۆی دەهێنێت و، لە جێگایدا بنیاتی دەنێت.

ئەو جووڵە ئەفسووناوی و پڕ لە تەلیسمانەی نوێژ کە ڕۆژی چەند جارێك بیرکردنەوە و خولیاکانمان گۆش دەکەن، هەمیشە ڕێگایەك و دەلاقەیەك و کلاوڕۆژنەیەك دەدۆزنەوە کە لێیەوە بمانگوازنەوە بۆ جیهانەکانی ئەودیو و، وا لە دڵمان دەکەن بڵێت:

"مەکانم بوو بە لا مەکان
هەموو جەستەم بوو بە گیان
نیگای خوایی بەدەرکەوت
خۆمم بینی، مەستی لیقا بوو"

(نەسیمی)

بەم شێوەیە عیبادەت، جارێکی تر گەنجینەی ئەو جوانییە ئەزەلییانەی کە لە دڵدا شاراوەن و، سەرچاوەی هەموو واریداتەکان، بە قووڵییەکی هێندە فراوان کە ناتوانرێت بترنجێنرێتە ناو سنووری ڕەهەندەکانەوە، ئاشکرا دەکات و دەریدەخات. لەبەر ئەوە، لەبری ئەو بابەتانەی کە لە نوێژدا بە ڕوونی دەردەکەون و دەزانرێن، زریانێکی هەست و نەستەکان هەڵدەکات کە سنووری چەندێتی و چۆنێتی تێدەپەڕێنێت و، ڕەنگ و بۆی هەیبەت

و مەزنی لێ دێت. هەمیشە لە نوێژدا شتانێك کە ناتوانرێت بوترێن ئاسۆمان دەتەنن.. هەستگەلێك کە دەربڕینیان ئەستەمە، مۆسیقایەکی نامۆ بە گوێی ڕۆحماندا دەچپێنن.. چەند هەست کردن و بیرکردنەوەیەك بوونمان داگیر دەکەن کە لە قاڵبی زمانی ڕۆژانەدا جێیان نابێتەوە.. وە فەتانەتێك کە ڕەنگی غەیبی گرتووە و، سنوورەکانی عەقڵی ماددی و لۆجیکی ڕووتی تێپەڕاندووە، دەرگای بیرکردنەوەی زیندووبوونەوە و مەعاد -کە درێژبووەوەی خەتی پێغەمبەرانە- دەخاتە سەر پشت. لەم ڕووەوە دەتوانین بڵێین کە بەندە پەرستشێکی لە نوێژ گەورەتر و، حاڵەتێکی تەندروستتر و فراوانتری نییە لەو خەیاڵ و تەسەووڕانەی کە لە کاتی نوێژدا جۆش دەسەنن.

ئەو ئاسۆی نوێژەی کە تیایدا ڕۆحی مرۆڤ لەڕووی هەست کردن و تێگەیشتنەوە، بازنەی شهود و وجود دەبڕێت و، دەگات بە جیهانی غەیب، کەسێك هەست بەم حاڵەتە بکات، لە حەسرەت و هیجرانی هەموو ڕۆحەکان تێدەگات و، وەك سروودێك دەیچڕێت. لە هەمان کاتدا ئاسوودەیی دڵ و، شەماڵی هەستە مرۆییەکان و، سەرگوزەشتەی ئەزەلیی بوون و، تەماشاکردنی ئەستێرەکان بۆ زەوی و، نهێنییەکانی ئاسمانەکان و، ڕووناکییەکانی عوقبا و، قەدپاڵەکانی بەهەشت و، ئەو درەختانەی لە قەدپاڵەکانیدا دەشنێنەوە و، ئەو ڕووبار و کانیاوانەش کە بەژێر درەختەکانیدا تێپەڕدەبن، دەچڕێت.. بە ڕوکنەکانی نوێژ دەیهێنێتە سەر زار، بە قورئانەکەی ناوی دەیڵێت. دەیڵێت و هەمیشە بە شێوازێکی زۆر تازەتر دەیڵێتەوە و، بە جۆرێك دووپاتی دەکاتەوە وەك ئەوەی کەوسەر دەرخواردی ڕۆحەکانمان بدات...

پاش وەستان بەپێوە (قیام)، ئەم بەندە ڕاستگۆیانەی کە وابەستەی بەندایەتین، ئنجا دەیانەوێت لەسەر سەکۆی ڕکوعیشدا هاوار بۆ هەیەجانی ڕۆحی بێگەرد و، شەونمی بیرکردنەوەی ڕاستڕەویان، بکەن. بە هەستێك کە تێکەڵەیەکە لە مەزنی و، جەبەروت و، ڕەحمەت و، لوتف و، بەرگی هەیبەتی پۆشیوە، وەکو عەسایەك دەچەمنەوە.. دەچەمنەوە و بە شعوورێك کە هەتا سەر ئێسقان هەست بە بەندایەتی دەکەن و، هەردەم شکۆمەندیی خوایی دەڵێنەوە و، بە ڕکوع -کە یەکێکە لە شێوازەکانی ڕووکردن لە خوای گەورە لەناو دانیشتوانی ئاسمانەکاندا- لە دەرگاکانی حەزرەتی قوددوس دەدەن و، بە ئەندازەی کرانەوەی ئەو دەرگایانەش، دەگەن بە قووڵایی جیهانەکانی ڕۆح، هەروەك لە حەج و گەشتەکانی تردا لە کاتی سەرکەوتن بەسەر بەرزاییەکاندا و دابەزین لێیان، تەکبیر و تەهلیل دەکرێت، بە هەمان جۆر لە نوێژیشدا کە ناونیشانی گەشتی میعراجی ڕۆحە، لە کاتی تێپەڕبوون لە بەشێکەوە بۆ بەشێکی تر، بە هەمان هەست و بۆچوونی پیرۆز و، بە هەمان وشەی پیرۆز گوزارشتی لێ دەکرێت. لە هەموو ڕوکنێکدا، بەو تەکبیر و تەحمیدانەی دەکرێن و، ئەو تێبینییانەش کە ئەم وشانە بانگهێشتیان دەکەن، دەست بۆ قوڵفی دیوانی هەرە مەزن دەبرێت و، پاشان دەست دەکرێت بە چاوەڕوانییەکی پڕ لە بێداری و، دیققەت و، وریایی، وەك ئەوەی مرۆڤ بیەوێت بە باشترین شێوە سوود لە کاتێکی زۆر پیرۆز وەربگرێت و هەڵیبسەنگێنێت.. چەشنی هەستیاریی پشیلەیەك کاتێك چاوەڕوانی نێچیرەکەی دەکات، مانەندی سەبری جاڵجاڵۆکەیەك، هەوڵ بۆ شکاری دەرەوشانەوە و واریداتە خواییەکان دەدات.

لە نوێژدا ڕکوع، هەنگاوێك لە پێش (قیام)ەوە، هەناسە ژیانبەخشەکانی خۆیمان بەسەردا دەبارێنێت و، لە خەونێکەوە کە مەحاڵە لەم دونیا سنووردارەدا بێتە دی، ئای چ شتانێك بە گوێی ڕۆحماندا دەدات کە لە ژیان جوانتر و، زۆر لە چێژە جەستەییەکان بەلەزەتترن و، هەرگیز خەیاڵیش ناتوانێت بە داوێنی بگات. پەیمانی چەند ڕۆژ و، سەعات و، خولەکێکی زومرڕوتیی بە دڵمان دەدات، جیاواز لەو شتانەی کە داوامان کردوون و چاوەڕێیان بووین. مەگەر ئێمە لە ڕوویەکەوە منداڵی هیوا و، بیرکردنەوە و، خولیا و، چاوەڕوانییەکانی خۆمان نین؟ زۆربەمان کاتێك بە ناڕەحەتییەکانی ئەمڕۆ دەهەژێین و چاومان لە ئاستی ڕاستیدا دەکرێتەوە، کاتی ئێستا تێدەپەڕێنین و، بە ئومێدی ئەو ژیان و بەختەوەرییەی کە لە داهاتوودا بەدەستی دەهێنین ڕوو لە "کاتی ئایندە" دەکەین و، بە خەندەیەکەوە قەدپاڵەکانی بەهەشت دەپشکنین.

ڕکوع، لەو ڕووەوە کە بە مانای لارەملی و کزۆڵی دێت لە بەرامبەر خوای گەورەدا، دەنگێك لە هەموو قەدە چەماوەکانەوە وەردەگرێت و، جاری وا هەیە "رَبِّي انِّي مَسَّنِيَ الضُّرُ"[1] دەڵێت و، جاری واش هەیە سەدای "إنَّمَا أشكوا بَثِّي و حُزنِي الى الله"[2]ی لێ بەرز دەبێتەوە و، هەواڵی هاژەیەك لە ڕوباری "ژیان"ەوە و، خەبەری بۆنی کراسێك لە شاری یوسفەوە دەهێنێت. بە خۆشیی سەرهەڵدانی چەند کاروبارێکی نائاسایی لەودیو سنووری حەقیقەتەکانەوە، تاومان دەدات. هێندە جۆش و خرۆشمان پێ دەبەخشێت، بەو زریانی سوپاس و ستایشەی کە لە هەموو بوونمانەوە دەپرژێت،

---

١. واتە: "پەروەردگارا! بەڕاستی زیان و ئازارم پێگەیشت."

٢. واتە: "شکاتی شپرزەیی و خەفەتی خۆم بۆ لای خوا دەبەم."

کەمەرمان ڕاست دەکەینەوە و، فەسڵێکی منەت و سوپاسگوزاریی تری پێشکەش دەکەین. ئەم بەپێوە وەستانە کورتە، لەوەی یەکەمیان جیایە و، بەندەرێکی بەرەو خوا دەرچوونی جیاوازە. لەم بەندەرە نوورانییەدا جارێکی تر تەسبیحاتەکانی (قیام) و خوێندنەوە و ڕکوع، بە قووڵاییەکانی ڕۆحماندا تێدەپەڕێنین و، تێدەکۆشین ڕەهایی هەستەکانمان و، بێسنووریی خەیاڵەکانمان بترنجێنینە ئەم وەستانە کورتەوە و تیایدا هەستی پێ بکەین. هەموو هێزی هەستمان بە مەبەستی ڕاوکردنی واریدات دەخەینە گەڕ و، بە شنەی ئەو "گەنجینە شاراوە"یەی دەستمان لێی گیر دەبێت، خۆمان ڕادەستی شەپۆلێکی فراوانتر و ڕەنگاوڕەنگتر دەکەین. تێگەیشتن و تەسەوور کردنی حەز و چێژی ئەوانەی لە ڕکوعدا نوێژ دەبیستن و لە (قیام)دا گوێی لێ دەگرن و، لە نێوەندی چ ڕێز و خەشیەتێکدا دەتلێنەوە و، بە چ هیوایەك دەگەشێنەوە و بە چ ترسێك هەڵدەلەرزن، یەکجار سەخت و گرانە. ئەم هەست کردن و، بیستنە، یەکەمینی ئەو هەنگاوانەیە کە بۆ بەیەك گەیشتن دەنرێن و، سوجدەش دووهەمیانە.

سوجدە، بریتییە لە زەمینەی شوکری ئەو بەهرە و درەوشانەوانەی کە لەناو نوێژدا بەدەست هاتوون و، ئەو مەنجەڵەیە کە تێیدا دڵە پێگەیشتووەکان دەکوڵێن و بەتەواوەتی دەڕژێنە قاڵبی بەندایەتییەوە و، لە نێوان دوعا و گیرابوونیدا وەك هێڵێکی ڕاست وایە لە نێوان دوو خاڵدا و، جێژوانی ئەو هەست و بیرکردنەوانەیە سەبارەت بەو زاتەی کە دەدۆزرێتەوە و دەناسرێت، دەناسرێت و مرۆڤ خۆشیدەوێت. ئێمە کاتێك لە پێگەی ڕاستەقینەی خۆیدا هەست بە سوجدە دەکەین و گوێی بۆ

ڕادەگرین، چەپکێك کە لە ئیمان و ئیسلام و ئیحسان تکاوە، بەنێو (قیام) و ڕکوعەکانی نوێژەکانماندا تێپەڕیوە و، ڕژاوەتە ناو تەپۆڵکە زومرڕوتییەکانی دڵمانەوە.

لە سوجدەدا سەر و قاچەکانمان لە یەك خاڵدا یەکدەگرن و وەك بازنەیەك لوول دەخۆین و، چەشنی کەوانێك دێینەوە یەك و، دەبین بە دەنگێك و هەناسەیەك و دەناڵێنین و، فراوانیی هیواکانمان کە زۆر لە پێش کردەوەکانمانەوەن، هاوڕێ لەگەڵ پێشکەوتن و سەرکەوتنی ڕەحمەتی خوایی بەسەر هەموو شتێکدا، تێکەڵاو دەکەین لەگەڵ ئیمانەکەماندا و، بە تێپەڕبوون بەژێر ئەم قەوسەدا کە سەرێکی لە دنیادا و سەرێکی لە عوقبادایە و، لە پەلکە زێڕینە دەچێت، هەوڵی گۆڕینی چارەنووسمان دەدەین. مرۆڤ کاتێك لەسەر ئەو لوتکەی بەختەی کە بەهۆی هەست و نەستەکانی ناو سوجدەوە بەرزبووەتەوە بۆی، تەماشای حەقیقەت دەکات، بە بەکارهێنانی زمانی دڵ و، هەڵڕشتنی هەموو وشەکانی هەستی و، بە هەندێك ئاڕاستە کردنی دنیا بەرەو ئاخیرەت و، هەندێکیش وێنە دانەوەی جیهانەکانی ئەودیو لە دنیای ڕۆحیدا، لەوانەیە هەست بە مەزهەرییەتێکی وا بکات وەك ئەوەی داستانی بەندایەتی بڵێتەوە.

بەڵێ، کاتێك دوعاکانی مرۆڤ کە بە شعووری بەندایەتی خرۆشاون، ڕۆدەچنە ناو ڕوباری ڕەحمەت و لوتفی خوایی و یەکانگیری یەك دەبن و، دوعا و وەڵامەکەی دەگەن بە یەك، هەستەکانمان وەك ژیانی بەهەشت جوان و، وەك فراوانی بەیەك شادبوونەوەش، شەپۆل دەدەن. سەبارەت بەوانەی لەمە تێدەگەن، تامی ئەم جوانییانە هێندە خۆش و، شێوەکەشی هێندە سەرنجڕاکێشە، ئەوانەی تەنها جارێك هەستی پێ

دەکەن و دەیچێژن، نازانن چۆن سوپاسی ئەم نیعمەتانە و خاوەنەکەیان بکەن.

پاڵەوانێکی نزیك لە خوا کە سەری لە زەویدایە و بە لوولپێچێك لە ڕووناکیی هەڵزناوە بۆ لوتکە هەرە بەرزەکان و، بە گەشتی ئاسمانیی، قووڵیی و فراوانی بەخشیوە بە نزیکییەکەی لە خوای گەورەوە، بە هەست و شعوور و خوماری گەیشتن بە حەزرەتی قوددوس و، بە مەبەستی ئەوەی ویساڵەکەی بە ڕەهەندێکی تریش ڕەنگدار بکات، بە گەورە زانین و ڕێزی خۆی پێشکەش دەکات و، بە ڕێزەوە سەری هەڵدەبڕێت و، بە ئەدەبی ئامادەبوون لە حزووردا "التحيات" دەڵێت و، لە هۆشی خۆی دەچێت و، لە حاڵ و، مانا و، سیحرێکی واوە دەپێچرێت، وەك بڵێی چیتر بوونەوەرێکی زەوی نشین نییە.

ئەو قارەمانی بواری نوێژەی کە بە حەزە فراوانەکانی نوێژ دەجۆشێت، بە هەستێك کە تێربوون ناناسێت و، لە سەروو سنوورەکانی چەندێتی و چۆنێتییەوەیە، گیان و ماڵ و هەموو بەخششە خواییەکان، بە نییەتەکەی قووڵی و بێسنوورییان پێ دەبەخشێت و، بە یەقینەکەشی پەیوەستیان دەکات بە خواوە و، بەم شێوەیە دەیانکات بە شتانی ڕەها، لە بەرامبەر هەموو ئەمانەشدا ڕوو دەکاتە بەجێهێنانی قەرزی ئەستۆی و، بە گشت هەستیاریی دڵی یادی خوای گەورە دەکاتەوە و دەناڵێنێت.. یادی پەیامبەر دەکاتەوە، ناخی پڕ دەبێت لە کرانەوە و ئاسوودەیی.. بیر لەو مرۆڤانەی تر دەکاتەوە کە هاوبەشن لە هەمان بەختەوەریدا، دوعای خێریان بۆ دەکات.. ئەم ڕێگای میعراجەی کە بە تەکبیر دەستی پێ کردبوو، بە شەهادەت -کە بە کۆڵەکەی دین دادەنرێت- کۆتایی پێ دێنێت...

ئەو مرۆڤانەی کە بە نوێژ ڕاهاتوون و پێی گۆش دەبن، هەرگیز تێری لێ ناخۆن. نەك هەر تێر نابن، بەڵکو لەگەڵ تەواوبوونی هەموو نوێژێکدا، "نییە زیاتر؟" دەڵێن و، لەم نوێژی سوننەت بۆ ئەوی تر ڕادەکەن و، لەگەڵ نوێژی چێشتەنگاودا وەك خۆر بەرز دەبنەوە و، بە (أوابين)یش دەستیان بەر قوڵفی دەرگای قوربەت دەکەوێت و، بە شەونوێژیش ڕووناکی بۆ بەرزەخ ڕەوانە دەکەن، هەوڵ دەدەن ژیانیان لەسەر بنەمای پەرستش بچنن و، هەرگیز نایانەوێت لەو نوور و مانایانە جودا ببن کە ڕۆحیانی لە باوەش گرتووە.. بەڵێ، نایانەوێت جودا ببن و هەمیشە بە هەڵەداوان بەدوای جوانییەکانی عیبادەتدا ڕادەکەن.

# وەفا

وەفا یەکێکە لەو گوڵانەی کە لە کۆڕی دۆستاندا دەڕوێت. بە دەگمەن لە کەشی دوژمنایەتیدا دەبینرێت، بەڵکو مەحاڵیشە. وەفا بەردەوام وەك هەوایەك لە دەوروبەری ئەو کەسانە هەڵدەکات کە خاوەنی هەمان هەست و هزر و خولیان. هەرچی ڕق و قین و حەسودیشە، بۆ ساتێکیش بێت مافی ژیان بەگوڵی وەفا نادەن و دەیکوژن. بەڵێ، ئەو لەژێر سایەی خۆشەویستی و مرۆڤایەتیدا بەرز دەبێتەوە و پێدەگات، بەڵام یەك سات لە ناو ئاو و هەوای دوژمنایەتیدا بێت دەژاکێت و نامێنێت.

هەندێك پێناسەی وەفایان بەوە کردووە کە پێویستە ئەم هەستە ئاوێتەی ناخی مرۆڤ ببێت. ئەم پێناسەیە گەر کەم و کورتییەکیشی تێدابێت ماناکەی هەر ڕاستە. لەڕاستیدا هەبوونی وەفا لای کەسانێك کە خاوەنی ژیانی ڕۆحی و گیانی نین، یەکجار سەخت و گرانە. دەربڕینی وتەی ڕاست لە کاتی قسەکردن و وەفاداری بەرامبەر بەو سوێند و پەیمانانەی کە دراون، وابەستەن بە ژیانی ڕۆحەوە. ئەوانەی نەیانتوانیوە خۆیان لە

درۆ و هەڵخەڵەتاندن بپارێزن، هەمیشە بە پێچەوانەی ئەو پەیمانەی داویانە مامەڵە دەکەن و، هەست بە قورسایی لێپرسراوێتی سەرشانیان ناکەن. بەڵێ، گریمانکردنی هەبوونی ژیانی مەعنەوی لەم مرۆڤە دووڕوو و ڕیاکارانەدا تەنها خەڵەتانە. چاوەڕێکردنی وەفاش لەم جۆرە کەسانە نیشانەی بێئاگایی تەواو و خۆش باوەڕییە.

بەڵێ، ئەو کەسەی متمانە بە بێوەفا بکات، زوو یان درەنگ پەشیمان دەبێتەوە. ئەوەی بێوەفا هاوسەفەری ڕێی دووری بێت، لە ڕێگەدا بە تەنیا دەمێنێتەوە. ئەوانەش کە بێوەفایەك بە ڕابەر و چاوساغی خۆیان دەزانن، بەردەوام چاویان پڕە لە هیجران و هەمیشە نمی ئەم جۆرە سەرزەنشتانەیان لەسەر زارە:

"چاوەڕێی وەفابووم لەو
چاوم پڕبوو لە هیجران
کەوتم بێ دەوا و دەرمان..."

تاك، بە هەبوونی وەفا شایەنی باوەڕپێکراویی دەبێت و بەرز دەبێتەوە. ئەگەر خێزان لەسەر وەفا بنیات نرابێت بەردەوام دەبێت و بە تەڕ و تازەیی دەمێنێتەوە. گەلیش بەم هەستە بڵندە دەگاتە فەزیلەت. دەوڵەت تەنها بەم هەستە دەتوانێت پێگە و متمانەی خۆی بپارێزێت لە بەرامبەر هاوڵاتییەکانیدا. لە وڵاتێکدا کە وەفای تێدا کاڵ بێت، نە تاکەکانی پێگەیشتوو دەبن و، نە خێزانەکان ئاشتی و ئاسوودەییان تێدا دەبێت و، نە دەوڵەتیش خاوەنی متمانە و دامەزراویی دەبێت. لە وڵاتێکی وەهادا کەسەکان دەبن بە سەرچاوەی

گومان بۆ یەکتر و، ئەندامانی ناو خانەوادەش نائاسودەن و، دەوڵەتیش بۆ گەلەکەی دەبێت بە بەدبەختی و، هەموو شتێك وەکو بێگیانەکان بە یەکتری نامۆ دەبن، هەرچەندە لەسەر یەك و لەناو یەکیشدان...

وەفا، یەکگرتن و یەکێتیی تاکەکان دەستەبەر دەکات. لە سایەی وەفادا بەشەکان دەبن بە گشت، پارچە جیاجیاکان دەگەن بەیەك و تاکێتی دروست دەکەن. کاتێك هەستی وەفا گەیشتە مەنزڵی بێپایانی، ئەوکات لەو مەنزڵەوە شەبەنگی ڕووناکی دەگاتە سەر کۆمەڵەکان و، ڕێگاکانیان بۆ ڕووناك دەکاتەوە و، هەرچی بەربەستی ناو کۆمەڵگا هەیە هەڵیدەگرێت. بەو مەرجەی ئەو کۆمەڵگایە بە هەستی وەفا پێگەیشتبێت و خۆیان ڕادەستی باوەشی میهرەبانی ئەو بکەن.

دڵت داوە بە پەیامێك؟! یان وابەستەی ئامانجێکی باڵا بوویت؟!.. دۆستایەتیت لەگەڵ یەکێك بەستووە؟! مادەم وایە وەرە، دریغی مەکە و گیانت فیدای بکە، با سەروەت و ماڵت تاڵان بکرێت و بڕوات، بەڵام تۆ هەر بە وەفا بە!! چونکە وەفا و وەفاداران لای خواو لای خەڵکیش خاوەنی پلە و پایەن.

"بانگێك هات لە خواوە، وەرە ئەی عاشق تۆ مەحرەمیت،

ئێرە مەقامی مەحرەمییەتە، تۆ لە ئەهلی وەفا حسێبیت"

(نەسیمی)

حەزرەتی ئادەم (علیه السلام) بە کلیلی نهێنی وەفا کە لە دڵیدا هەڵیگرتبوو، یەك لەدوای یەك دەرگا داخراوەکانی واڵا کرد و گەیشت بە چاوگەکانی "لێخۆشبوون". لە هەمان ڕووداودا ئیبلیسی لەڕێ دەرچوو بە ئاشکرا ڕۆیشت و خۆی فڕێدایە نێو چاڵی دۆزەخەوە و تێیدا خنکا.

پێغەمبەری تۆفانیش، حەزرەتی نوح (علیه السلام)، تەمەنێکی چەندین سەدەیی پڕ لە خەم، بەڵام تەژی لە وەفا ژیا. ئاگادارکردنەوەی چەندین ساڵەی ئەم پێغەمبەرە کاریگەریی لە کۆمەڵێکی زۆری نێو هۆزەکەی نەکرد، بەڵام ئەمە نەبووە هۆی دوورخستنەوەی حەزرەتی نوح لەو هەستی وەفایەی کە بەرامبەر دەرگانەی پەروەردگاری خۆی هەیبوو. ئەم هەستی وەفادارییە، لەو کاتەشدا کە ئەرز و ئاسمان شەپۆلی تووڕەییان ئاڕاستەی مرۆڤایەتی دەکرد، بوو بە کەشتییەکی فریادڕەس بۆی.

دۆستی هەق و باوکی پێغەمبەرانیش لە کاتی ڕووبەڕووبوونەوەی ئاگری نەمروددا چەندە وەفاداربوو! هەناسەی وەفادارانەی ئەم پێغەمبەرە ئازیزە کە لە شێوەی (حەسبی حەسبی!) دا بوو، ئاسمانەکانی دەهێنایە وەلوەلە و، کاتێکیش لەگەڵ شەماڵی لەدوورەوە هاتووی ڕەحمەتدا یەکانگیر بوو، سینەی ئاگرە دۆزەخ ئاساکان لەبەرامبەر ئەمدا بوو بە "بەرد و سەلام".

پێشەنگی قودسییەکان، یەکەمینی سەرجەم هاتوو و ڕۆیشتووەکانیش، لە گەشتی ئەودیوی ئاسمانەکاندا کە بە نسیبی کەس نەبووە، لە سایەی وەفای نێو ڕۆحیدا سەرکەوتوو بوو. بەڵێ، ئەو لەم سایەیەدا گەیشتە ئەو هەرێمانەی کە فریشتەکان پێی ناگەن و، بەو دەوڵەتانەش گەیشت کە هیچ فانییەك نایگاتێ. پاشان هەستی وەفاداری بەرامبەر بە ئوممەتەکەی وای

لێ کرد ئەو جیهانی بەختەوەرییە جێبهێڵێت کە چاوەکان لە بەرامبەریدا ئەبڵەق دەبوون و دڵەکان لەبەردەمیدا سەرسام و مەست دەبوون و، گەڕایەوە بۆ ناو هاوەڵەکانی. بڕیاربوو دەرگیر ببێت لەگەڵ ڕووداوەکاندا و، سنگ لە تەنگانە و ناڕەحەتییەکان دەرپەڕێنێت و، ئەوانیش بەرەو ئەو هەرێمە مەزنانە بەرز بکاتەوە... هەستی وەفاداری بەرامبەر دۆست و هاوڕێیانی بوو وای لێ کرد بەهەشت و حۆرییەکانی بیر بچێتەوە. ئەو پەیمانێکی وەفای بەوان دابوو، ئەم پەیمانە وای کرد لە کاتی گەیشتن بە سەرجەم شکۆمەندی و جوانییە ئاسمانییەکاندا، هەموو پلە و پایە مەعنەوییەکان بخاتە لاوە و، دیسان بگەڕێتەوە بۆ ناو ئەم دونیا پڕ لە خەم و پەژارەیە!..

دەفتەری کردەوەی هەموو ئەو چاکەکارانەی کە بەرزبوونەتەوە، بە وەفا کۆتایی پێهات و بە وەفاش مۆر کرا. کتێبی ناشرینی لەڕێ جێماوانیش مۆری بێوەفایی لێ درا. بەڵێ، ئەوانەی فەرمانبەرییەکەی سەر شانیان پاش چەند هەنگاوێك دادەنێن و لەم بارەیەوە بێوەفایی دەنوێنن و دەخزێنە سووچێکەوە، مۆری سەرشۆڕی و ڕیسواییان خوارد و فڕێدرانە نزمترینی نزمییەکانەوە. ئەوانەی تەنانەت بۆ چارەکە ڕۆژێکیش ئارامیان لەسەر ئەم ئەرك و ڕێبوارییە پیرۆزە نەگرت و خۆیان لێ دزییەوە، بوون بە گروهی ملهوڕانی ڕێ ونکردوو.

دواجار کاتێك نۆبەی خەمی پیرۆز هاتە سەر ئێمە، بە چاکترین پەیمانی وەفاوە هاتینە ژێر باری ئەم بەرپرسیارێتییە مەزنەوە. بە جۆش و خرۆش بووین و خاوەنی عەزم بووین و بڕیارمان دامەزراو بوو. بەڵام هەیهات... دێوێکی چاوەڕواننەکراو ڕێی پێ گرتین و هەموو ئەو پەیمانانەمان شکاند کە دابوومان. دواتریش، هەموو لایەك بووەوە بە بیابان.

هەموو جوامێرییەکان وەك ڕۆن توانەوە. دڕکەکان شوێنی گوڵەکانیان گرتەوە. کاتێك مانگ و خۆرەکان یەك لە دوای یەك ئاوا دەبوون، هەورە تاریکەکان چواردەوریان تەنی. باخ نەما و باخەوانیش مرد. شانەی هەنگ خامۆشبوو و، هەنگوینیش نەما. ئیدی بەدبەختانی ئەم سەردەمەی کە گیرۆدەی قاتوقڕی ئینسان هاتن، کەوتنە پیاهەڵدان و مەرایی کردن بۆ ئەو ڕۆحە مردووانەی کە دڵیان خاڵییە لە هێندەی گەردێك لە ئەمانەت و هەستی وەفا. بە وتنی "چەند ئاقڵە، چەند جوامێرە!"، ڕۆحی خاو نەما چەپڵەی بۆ لێ نەدەن.. ئەمەش ئەو دوا ناڵە و دوا نەعرەتەیەیە کە لە دڵی میللەتی ئەو سەردەمەوە بەرز دەبێتەوە و وەك یاخی بوونێك وایە بەرامبەر بە بێوەفایی و، قیژەیەکی تیژە:

"وەفا نەما، ڕێزی پەیمان هیچ، ئەمانەت لەفزی بێ مەدلوول،

درۆ خاوەنی ڕەواج و، خیانەت پێویستی و، حەق مەجهول.

دڵان بێ ڕەحم و، هەستەکان نزم و، هیواکان خار،

نیگای هەموو جارێك، بەندەی خوا دەکات ئیستیحقار.

ژیری دەلەرزێ یا ڕەب، چ گۆڕانێکی ترسناك ڕووی داوە،

نە دین ماوە نە ئیمان، دین خەراب و، ئیمان تووراب!"

(محمد عاکیف)

لەم سەردەمەدا چەندین دێو و درنج داهاتن کە دیلی درۆ و زیادەڕەوین و هەموو لایەکیان تەنیوە. چەند داهۆڵێك کە ڕۆژی چەند جارێك سوێند دەشکێنن و، هەموو جارێك لە عەهد و پەیمان پاشگەز دەبنەوە و، بۆ

هەمیشە لە هەستی وەفا بێبەش بوون!.. زەوی و ئەوانەی لەسەرین نەفرەتیان لێ دەکەن، ئاسمان و دانیشتووانیشی نەفرەتیان بۆ دەنێرن.

ئەم هەموو "ناچیز و بەدڕەوشت"ە لەکوێوە هاتن؟! کام خیانەتکار باوەشی بۆ ئەمانە کردەوە و دایکایەتی بۆ کردن؟!.. کام بەدبەخت ئەمانەی لە سینەیدا گەورە کرد و کام دەمی شووم فەرمووی لەمانە کرد؟!..

ئای وەفا، تۆ لە کوێی؟! بێزاربووین لەوانەی هەموو ڕۆژێك چەند جارێك سوێندیان دەشکێنن و لە پەیمان پاشگەز دەبنەوە، لەو نامەردانەی هەموو وتەیەکیان زیادەڕەوی و گشت ڕەفتارێکیان دەستکردە، لەو دڵە شوومانەی بێبەشن لە هەستی بەرزی وەفا!.. لەکوێن ئەی ئەو دۆستە وەفادارانەی لەو شوێنەی پەیمانتان داوە، بێ جووڵە و بەپێوە چەندین ڕۆژ چاوەڕوانیی دەکەن!.. لە کوێن ئەی ئەو مەردی کوڕی مەردانەی کە وەفا لەگەڵ ڕۆحتاندا یەکانگیر بووە!.. لە کوێن ئەی ئەوانەی لەپێناو وەفایەکدا بوون بە خاك و لەناوچوون، ئەی مرۆڤە نێوچاوان سپییەکانی سەردەمێکی زۆر بەرەکەتدار!.. هەستن، وەرنە نێو ڕۆحمان.. خەیاڵەکانمان تاویدەن، چیتان بە ناوی وەفاوە پێیە بیرێژنە نێو سینەمان، ئەو سینانەی کە مەردایەتی و پاڵەوانێتی و وەفای بەتەواوی لەیادچووە!.. لەم ڕێگای ژیانەوەیەدا بمانگەیەنن بە کانیی خزر! وەرن، وەرن و ئەم دوو سێ مرۆڤە بەوەفایەی لێرە و لەوێ دەسووڕێنەوە، لە تێکشکان و نائومێدی ڕزگار بکەن!..

بە ئومێدی سەلامەتیی بیرۆکەی وەفا لەلای ئەم نەوەیەمان کە تینووی وەفایە...

# ڕوانگەیەک

"کتێبێکی خوایی مەزنە سەراسەر کائینات،
دەست بدەیتە هەر پیتێکی، ماناکەی هەر "خوا" دەکات."

(ڕ. م. ئەکرەم)

ئەو کەسانەی دەزانن چۆن تەماشای خۆیان و دەوروبەریان بکەن، هەمیشە ئەو جوانییە سەرسووڕهێنەرانەی لە سینەی بووندایە و، شەپۆل شەپۆل دەڕژێنە چاوەوە و، دڵۆپ دڵۆپ دەتکێنە دڵەوە و، ئەو ڕێکوپێکی و یاسایەی کە لە ناوەرۆکیدایە و، ئەو هۆنراوەیەش کە لە ماناکانیدا بەرجەستەیە، سەبارەت بە ئەوان دڵان لە خۆشەویستی و عەشق و پەیوەندییەکی هێندە بەهێز پڕدەکات، بەجۆرێك ئەگەر بوترێت ئیدی لە دنیادا چێژێکی تر نەماوە تامی بکەن، پێدەچێت ئەم بڕیارە زیادەڕەوی تێدا نەبێت. سەبارەت بە ئەوان هەر شتێك کە دەیبینن و دەیخوێننەوە، کاسەی خۆشەویستییان پێشکەش دەکات.. هەستە مرۆییەکان دەهێنێتە

جۆش و لە ڕۆحیاندا هەیەجانێکی خامۆش نەبوو هەڵدەگیرسێنێت.

هەموو گەردوون و شتانی ناوی لە بەرامبەر ڕوانین و هەست کردنێکی لەم جۆرەدا بەڕن و باڵا و شێوەیەکی جیاواز بەدەست دەهێنێت.. بوونەوەر و ڕووداوەکان زمانیان دەکرێتەوە.. وەك ئەوە وایە ڕووناکی ئەفسووناوی دابکات بەسەر گیاندار و بێگیان و هەموو شتێکدا.. شوێن، سنوور و ڕەهەندەکانی خۆی تێدەپەڕێنێت و، کاتیش قووڵ دەبێتەوە و دەبێت بە خاوەنی جوانییەکی ئاخیرەتی. کاتێکیش سەرجەمی شتان بەم شێوە هەرە جوانە خۆیان دەردەخەن و گەواهی لە خۆیان دەدەن، خۆشەویستی ناخمان بۆ بەدیهێنەر، عەشق و پەیوەندییەکەی هێندە زیاد دەکات کە سروودی بەیەك گەیشتن لە بەردەم خۆیەوە دەچڕێت.

لەم جۆرە حاڵەتانەدا کاتێك هەستەکانمان دێنە کوڵ و، ئەست و تێگەیشتنمان دەگۆڕێت و، ئاسۆی تێگەیشتنمان فراوان دەبێت، زۆربەی جار لە پەیوەندییەکانی ڕۆژانە دەرباز دەبین و، ڕوو دەکەینە ئەودیو پەردەی هەموو ئەم شتانەی کە ڕوودەدەن و، بە یارمەتی ئەو فراوانییەی کە هەستی ئاخیرەتیبوون بەخشیویەتی بە ڕۆحمان، ئەم گەردوونەی کە هەمیشە سەیری دەکەین و، ئەم سروشتەش کە لە سینەیدا بەدیهێنراوین، لەبەر چاومان دەبن بە چەند پیت و وشە و هۆنراوەیەك کە لە قەڵەمی خۆشەویست داچۆڕاون و، لە ئاستی گوێیەکانماندا دەبن بەو نەغمانەی کە لە ئامێری نەیەکەی ئەوەوە دێنە دەر و، وەك ئەوەی چەند گرێ و تاڵێکی نەخشە دەراساکەی ئەوبن تەماشایان دەکەین و، بە سەرسووڕمان و هەستی بەرز نرخاندنەوە پێشوازییان لێ دەکەین و، پاشان هەموو ئەم شتانەی پێیان دەگەین دەخەینە سەر سەرمان و، ماچیان دەکەین و،

دەیهێنین بە ڕوخسارماندا و، لەم ڕاڕەوی ویساڵەدا چەند خولەکێکی هەمیشەیی وا دەژین کە لەوانەیە بە ئەندازەی خودی ویساڵ بەتام و چێژ بێت. هەست دەکەین و تێدەگەین کە خۆشەویستی بەرامبەر بە ئەو و پەیوەندی لەگەڵ ئەو، هەموو شتێکە و، مەزنترە لە هەموو حەز و ئارەزووە ماددی و جەستەییەکان.

بەتایبەت لە هەندێك حاڵەتدا هەلومەرجەکان و بارودۆخەکان هێندە دڵ نەرم دەکەن و، فراوانی دەکەن و، ڕەهەندی ئاسمانیی پێ دەبەخشن، لەوانەیە ئەگەر لەم کاتەدا بەم جۆرە کەسانە بوترێت "فەرموون بڕۆنە بەهەشت!"، پێدەچێت یەکسەر بە "بەڵێ" وەڵامی ئەم پێشنیارە نەدەنەوە و، مانەوە لەم کەشوهەوای عەشق و ویساڵەدا هەڵبژێرن. چونکە ئەوان لێرە بە ئەندازەی فراوانی دڵیان لە بەهەشتدا دەژین، نایانەوێت لەم خەونی بەهەشتە بێدارببنەوە کە ڕۆژانە لە ناز و نیعمەتەکانیدا دەژین. پاشان ئەم دڵە بەوەفایانە چونکە ژیانێك دەژین ڕاستەوخۆ ڕووی لە زاتی داواکراو و خۆشویستراوی خوای گەورەیە، ئەوا لە ڕوانگەی ئاسۆی بیرکردنەوەی ئەوانەوە، ڕووتێکردن و داواکردنی بەهەشت -ئەگەر فیردەوسیش بێت- بە بێڕێزی ئەژمار دەکەن. ئەمە لە کاتێکدا کە بەهەشتی ئەو دنیا هەبێت و نەبێت گەورەبوون و فراوانبوونی ئەم بەهەشتەی ئێرەیە کە وەك تۆوێك لە ویژدانەکاندا دەژی و هەستی پێ دەکرێت. ئەویش (واتە بەهەشتی ئەو دنیا) بە ڕەحمەتی درێژەپێدان(تفصیل)ی ئەم بەهەشتە کورتکراوە(مجمل) یەی ئێرە دەزانێت و، بە خۆی دەڵێت "هێشتا وەرزی میوە نەهاتووە." و، هەموو شتێك دەسپێرێت بە ئیمان و هیواکانی.

لە ڕاستیدا ئەو شتەی کە ڕۆحی زۆربەمان بەدوایدا وێڵە و، زۆر

جار بێ ئەوەی بە خۆمان بزانین بە شوێنیدا ڕادەکەین، ئەو عەشق و پەیوەندییەیە کە بەرامبەر خوای گەورە هەمانە. ئەو جوانییانەی دنیا کە لە ڕۆحماندا سەرسامی دەوروژێنێت و، ئەو پەیوەندییە گەرم و گوڕەی کە لە نێوان هەموو بوونەوەراندا هەیە بە گیاندار و بێگیانیانەوە و، سەرجەم خۆشویستن و، خۆشویستران و، هیواکان و، خەونە شیرینەکان و، تاسە و ئارەزووەکان، بریتین لە درەوشانەوەی ئەو پەیوەندییە پڕ لە تەلیسم و نهێنییەی کە لەگەڵ ئەودا هەمانە. هەموو ئەو نیعمەتە دنیاییانەی تاممان کردوون و، گشت ئەو پاییزانەش بەسەرمان هاتوون، هەر یەکەیان درەوشانەوەیەکی ئاوڕلێدانەوە و ڕووتێکردن (توجە)ی ئەون لە ڕۆحماندا.

تەنها ئەوە کە ژیانمانی جوان و سەرنجڕاکێش کردووە، ئێمە بەو پشکۆی خۆشەویستییەی کە ئەو لە ناخمانی هاویشتووە ژیانمان خۆشدەوێت. لەم ڕووەوە ئێمە لە هەموو شتێکی گەرم و نەرم و دڵدەرەوە و هاودەمدا، سەرەتا ئەومان خۆشدەوێت و، سەرلەنوێ پەیوەندیمان بە ئەوەوە نوێ دەکەینەوە و، پاشان هەوڵ دەدەین چێژ و شەوقی خۆمان ڕاڤە بکەین. بە ناوی ئەوەوە دەست بە هەموو شتێك دەکەین، بە ناوی ئەوەوە بەردەوام دەبین لەسەر ژیان و کاروبارمان. لە هەر پەیوەندییەکدا کە لەگەڵ خۆماندا هەمانە، بە عەشق و خۆشەویستی ئەو دەخرۆشێین و، کاتێك تەماشای هەر شتێك دەکەین، نیشانە و ئاماژەی جۆراوجۆر دەبینین و، موچڕکە بە جەستەماندا دێت و، کاتێك زارمان هەڵدەبچڕین بۆ درکاندنی شتێك، لەو وشانەدا کە ئەو بە دیاری بە زمانمانی بەخشیوە، هەست بە ئەو دەکەین و، ئەگەر دووچاری عینادی و کەللەڕەقییەکی کوێرانە نەبووبین، ئای چ شتانێکی سەرسووڕهێنەر لەوەوە دەبیستین!

ڕووبەڕووی چ شتانێکی گوڵئەندام دەبینەوە کە خۆیان بە جوانییەکانی ئەبەدییەت ئارایشت داوە و، ئاشنایەتی لەگەڵ چ بوونەوەرانێك پەیدا دەکەین کە ڕوخساریان بە نووری ئەو ڕۆشن بووەتەوە و، دەگەین بە چ دیمەنگەلێك کە چاو لە بینینیان تێر ناخوات و، چ نهێنی و تەلیسم و مەتەڵێك خۆیمان بۆ دەکاتەوە!..

ئیدی بۆ کەسێکی لەم جۆرە، هەموو ئەو دەرگایانەی کە تا دوێنێ بەهۆی سپاردنیان بە نابینایی فەرامۆش کردن داخرابوون، دەخرێنە سەر پشت و، ئەو شتانەش کە هەتا ئەو ساتە هەستیان پێ نەکراوە وەك شتانێکی چاوەڕواننەکراو خۆیان دەردەخەن و، لەناکاو ڕەهەندەکانی بوون دەگۆڕێن و، مرۆڤیش سەرلەنوێ پایە و پێگەی خۆی دەدۆزێتەوە و، جارێکی تر ڕووبەڕوو دەبێتەوە لەگەڵ سیمای پڕ لە خەندەی بەختیدا. ئیتر لەمەولا هەر لە هەڵکردنی باوە هەتا بارینی باران، هەر لە ڕوبار و کانیاوەکانەوە هەتا دەریا و زەریاکان، هەر لە ئەستێرەکانی ڕازێنەرەوەی ئاسمانەکانەوە هەتا گوڵەکانی سەر زەوی، هەموو شتێك دەبێت بە پەیامێك لە لایەن خۆشەویستەوە و، بە جوانییە ڕەنگاوڕەنگەکانیان لە چاوان و دڵاندا خۆیان نمایش دەکەن.

ئەو، بە هەموو شتێکیەوە جوانە، ئەو شتانەی تایبەتن بە ئەو، ئەو شتانەش کە لای ئەوەوە دێن هەر جوانن. تەنانەت ئەوەندە جوانە کاتێك دڵێکی وشیار لە سیمای هەموو شتێکدا هێما و ئاماژەی هاتوو لە لایەن ئەوەوە دەبینێت، خوێن لە دەمارەکانیدا قوڵپ دەدات و، لەپێناوی گەیشتنێکی یەك چرکەساتیدا بە ئەو، فیداکردنی گیانی خۆی هێشتا بە کەم دەزانێت.

بێگومان لەم ڕووەوە هەموو کەسێك ئاسۆی تێگەیشتن و چەشتنی جیاوازە. ئەو ڕۆحە هەستیارانەی دەتوانن بە چاوی دڵ لە دەوروبەریان بڕوانن و، لە ڕێگەی تیژبوونی هەستەکانیانەوە گەیشتوون بە لوتکەی مەعریفەت و چێژە ڕۆحییەکان، مەگەر خوا بۆ خۆی بزانێت لەنێو چ خەیاڵگەلێکی قووڵدا مەلە دەکەن و، لە ئاسۆی بەختیاندا کە کراوەیە بەڕووی هەتاهەتاییدا، چ کۆشك و سەراگەلێك بنیات دەنێن! ئیتر با شەیدایانی ڕواڵەتیش هەر لە ڕووکەشدا بێن و بچن..

من بە ئەندازەی تەسکی و بچووکیی ئاسۆی تێگەیشتنی خۆم لە شتان تێگەیشتووم. باوەڕم وایە کە پاڵەوانانی ژیانی گیانی و ڕۆحی، تام و چێژی جیاوازیان لە هەموو شتێك بینیوە و دەبینن. هەمیشە باوەڕم وا بووە کە چەندین توانا و لێهاتنی بە ئەندازەی جیاوازیی نێوان ئاسمانەکان و زەوی بوونیان هەیە و، هەر کەسەش لە ڕوانگە و دیدگای خۆیەوە ڕوانین و دیتنی جیاوازی هەیە. لە کاتێکدا توانا و لێهاتنی مرۆڤە مەزنەکانم بەرز نرخاندووە، لێپرسینەوەم لە ئاسۆی زەوق و چێژی خۆیشم فەرامۆش نەکردووە. بەخیلیم بردووە بەو قارەمانی ویژدانانەی کە خاوەنی خەسڵەتی زیادەن و دەزانن چۆن سوود لە هەموو تایبەتمەندییەکانی مرۆڤ بوون وەربگرن...

پێگەی ئەو باڵا بەرزانە هەر چۆنێك بێت و، منیش پلە و پایەم چەند کورت و بچووك بێت، دیسانیش شیرینترین خەونەکانی ژیانم ئەو کاتانە بینیوە کە هەوڵم داوە دیوی ناوەوەی بوون و ڕووداوەکان بخوێنمەوە. بەڵێ، بە پێوەرە گچکە و تەرازووە خوار و خێچەکەم هەر چیم دەست کەوتبێت، بە گەورەترین دیاری و بەخششی ئەو بەهرەیەم هەژمار کردووە کە خوای گەورە بە مرۆڤ بەدیهێناوم.

هەندێك کەس بەو شتانەی دەیانبینێت و دەیانبیستێت دڵی ئاو دەخواتەوە و، بگات بە هەر جێگایەك ئیتر وا دەزانێت لوتکەی مەعریفەت و چێژە ڕۆحییەکانە. ئەمە لە کاتێکدا ئەگەر توانا و لێهاتنی بوار بدات و، بتوانێت یەك جووڵەی تر بکات و، هیممەتی خۆی بەگەڕبخات، ئای لە چوارچێوەیەکی جیادا چ دەنگ و وشەگەلێکی جیاوازتر دەبیستێت و، چ ڕەنگانێکی سەرسووڕهێنەر دەبینێت و، لە هەمبەر ئەم جوانییە سەیر و سەمەرانەدا لە هۆشی خۆی دەچێت و، دەڵێت "تومەز لوتکە ئەوێ نییە و ئێرەیە." ئەگەر بەوەشەوە نەوەستێت و زیاتر قووڵ ببێتەوە لەو شتانەدا کە هەستیان پێ دەکات و تەماشایان دەکات، کاتێك چەندین مانای نوێی تر ڕوو لە ڕۆحی دەکەن، لەژێر لێوەوە بە خۆی دەڵێت "نەخێر نەخێر، هەموو شتێك لەم خاڵەدایە کە ئێستا پێی گەیشتووم." و، ئەوێ بە کۆتا سنووری بینینی ڕاست و خوێندنەوەی ڕاست دەزانێت.

وشە و ڕستەکانی خوای گەورە و، ئەو کتێبە تەشریعی و تەکوینییانەش کە لە وشە و ڕستەکانی ئەو پێکهاتوون، بێسنوور و، ڕەها و، فرەڕەهەندە و، خاوەنی ناوەرۆکێکە کە ناکرێت هەرگیز بە تەواوەتی پەیی پێ ببرێت. ئەم بێسنووری و، زۆری و، دەوڵەمەندییە وەك سپاردەیەك تەسلیمی توانا و لێهاتنەکان کراوە. ئاسەوارەکانی فەیزی ئەو وابەستەی توانا و لێهاتنەکانە و، فراوان بوونی ڕۆحی هەر کەسێکیش بە ئەندازەی ڕووتێکردن و داوا و ویستیەتی...

# وته

یەکەم بەدیهاتن بە وتەی "کُن!" و، بە دوو پیت و یەك بڕگە دەستی پێکرد، کاتێك وەك تۆوێك فڕێدرایە ناو سینەی نەبوونەوە. ئەو ڕێگایانەی لە تاکەوە بەرەو زۆر و لە وەحدەتەوە بەرەو ئەبەدییەت درێژ دەبنەوە، بە وتە دەرکەوتوون و بە وشەکانیش ڕووناك بوونەتەوە.

کاتێك قەڵەم بەدیهێنرا سەرەتا نەیزانی چی بنووسێت و سەری سووڕما. بەڵام کاتێك نهێنی "وتە" بە گوێیدا چپێنرا، دەستی کرد بە هاوار کردن و، مرەکەبیش بە گریان. وە لەو ڕۆژەوە هەر کاتێك قەڵەم بە وتە بگات دەقیژێنێت و، مرەکەبیش فرمێسك دەڕێژێت...

ئەگەر وتە نەبووایە ئێمە هیچ شتێکمان سەبارەت بە ئەزەل نەدەبیست و، تێنەدەگەیشتین لەو نهێنییانەی بەدیهێنەری مەزن کە دڵ و چاوەکانمان پڕ دەکەن...پێش ئەوەی وتە لە دڵەکاندا دەنگ بداتەوە، مرۆڤ لەگەڵ ئاژەڵ و، ئاژەڵیش لەگەڵ خاك و بەرددا هیچ جیاوازییەکی نەبوو. لە سایەی وتەدا گەردوون بوو بە پێشانگایەك و ئەو کتێبانەش کە لای

خواوه هاتن شێوەیەی چەند دەلاڵ و بانگەوازکارێکیان وەرگرت. کاتێك وتە وەك تاجێکی ئاڵتوونی کرایە سەری جێنشینی ڕووی زەوی، مانای بوون ئاشکرا بوو و، ئێمەش تێکڕا بووین بە پارچەیەك لێی...

وتە، زەوی و ئاسمان و، دونیا و عوقبا پێکەوە گرێ دەدات. هەرچەندە مەزنی و جوانییەکەی بە هیی خۆی لە قەڵەم نادرێت، بەڵام هەموو شتێك موحتاجی ئەوە و، سەرچاوەی گشت جوانییەکی شاراوەشە.

ئەو، بەیداخێکی وەهایە کە شووراکان تێکدەشکێنێت و، ئاڵایەکی وەهاشە کە قەڵاکان فەتح دەکات، بەجۆرێك ئەگەر جیهانگیرەکان نەچوونە ژێر فەرمانڕەوایەتی ئەوەوە، تەنانەت گوندێکیشیان پێ ڕزگار نەکراوە. سەرکردەکان نەیانتوانیوە بچنە ئەو شوێنانەوە کە وتەکان تێی چوون و، سوڵتانەکانیش بە ئەندازەی ئەو نەگەیشتوون بە شان و شکۆ و، هیچ فانییەکیش نەیتوانیوە بەقەدەر ئەو تەمەنی درێژ بێت. هاتووان ڕۆیشتوون و، ڕۆیشتووانیش لە یادەوەرییەکاندا سڕاونەتەوە، وەلێ ئەو بە تەڕ و تازەیی وەك خۆی ماوەتەوە.

پاڵەوانانی وتە، بولبولی ئاسمانین. زمانی ئەوان کرانەوە و ئاسوودەیی بە سینەی دۆستان دەبەخشێت و، سەبارەت بە دوژمنانیش وەك کابوسی ترسناك وایە. ئەو وتانەی لە زمانی ئەمانەوە هەڵدەوەرێن لە شمشێری جەنگاوەران گەلێ تیژترە و، لە ڕم و تیرەکانیشیان زۆر ترسناکترە. پزیشکان توانیویانە برینی شمشێر و تیرەکان تیمار بکەن، بەڵام نەبینراوە برینی وتە چارەسەر بکرێت. کاریگەرترین و گەرموگوڕترینی وتە پێغەمبەران وتوویانە و، دوای ئەوانیش ئەو دڵانەی کە کراوەن بەڕووی

ئیلهامدا هێناویانەتە سەر زار. گاهـ بە تیرەکانی وتە جەرگی تاریکییان ئەنجن ئەنجن کردووە و، گاهـ بەهۆی پزیسکی وتەوە ئاگریان لە سینەکان بەرداوە و، کاتی واش هەبووە وشەکانیان چەشنی دڵۆپەی باران بە هەموو لایەکدا باراندووە و گشت جێیەکیان کردووە بە بەهەشتی لالەزار.

بەتایبەت کاتێك هەڵۆی ئیلهامیان باڵی گرتووە، بۆ کۆکردنەوەی ئەو مرواریییانەی لە زاریان دەکەوێتە خوار، فریشتەکانیش ڕایان کردووە و لە بەرامبەریانەوە لەسەر ئەژنۆ چۆکیان داداوە.

پاڵەوانانی وتە، وەك خۆر وان، سەرەڕای خۆیان، چواردەوریشیان ڕووناك دەکەنەوە.. مانەندی دەریان، لە سنگیاندا بەنرخترین خەزێنەکانی دنیا دەشارنەوە و، پێشیانەوە دیار نییە و، وەك مۆمێك ڕۆشنایی دەبەخشن. بەڵام هەمیشە سەریان کزە و بەرامبەر بە خوا شەرمەزار و لارەمل دەژین. لەناو خەڵکیدا خاکیترن و خۆبەکەمزانترین کەسن، لەگەڵ خواشدا تا بڵێی وریا و بێدارن. دەستە دەستە گەوهەر دابەش دەکەن بەسەر دەوروبەریاندا و، تەنانەت زۆر جار خۆیشیان هەستی پێ ناکەن. چونکە لە دنیای ناوەوەیاندا هەموو ساتێك بەدوای گەوهەر و مرواری بەنرختردا وێڵن. کاتێك ئەو نهێنییە ئەڵماسییانەی دۆزیویانەتەوە ئاشکرای دەکەن، سەدایان وەك شەیپوری قیامەت دەنگ دەداتەوە و، ئەفسوونیان ئینس و جینن سەرسام دەکات و، مەیخۆرانی مەیخانە و عیبادەتکارانی پەرستگا لە هەموو لایەکەوە بەرەو گەوهەرەکانی ئەوان تێدەکۆشن.

نازانم داخۆ ئەمڕۆ ئەم جۆرە لە سیحربازانی وتە کە تەنانەت

سیحرەکانی هاروت و ماروت پووچەڵ دەکەنەوە، بوونیان هەیە یان نا.. تەنها شتێك بیزانم ئەوەیە کە "وتە" لە دەست و پێ کەوتووە. لەمڕۆدا زۆرێك لەوانەی کە وەك زێڕەنگەرانی وتە دەبینرێن، بێ ئیلهامن و، داخراون بەڕووی جیهانی ئەودیودا و، دابڕاون لە خوا.. لەم ڕووەوە هونەری دەربڕین بەگشتی لە دەستی بەرباد و بێکەڵکەکاندایە.. باڵەکانی پەریی ئیلهام شکاوە و، لەو سنگانەشدا کە موحتاجی ئیلهامن، جادووگەرانی لاسایی و چاولێکەری خێوەتیان هەڵداوە.. لەبەر هەموو ئەوانە، بێجگە لە وتنی "خوا بتداتێ!" -وەکو ئەوەی بە سواڵکەران دەوترێت- هیچی ترمان لە دەست نایەت.

# هەناسەکانی دڵ

## محمد فەتحوڵڵا گولەن

مرۆڤی نوێ دۆزەرەوە و هەڵمەتبەرە. هەموو ڕۆژێك لە قووڵایی بوونیدا و لە فراوانی فەزادا، ئاڵای خۆی بەسەر قەڵای نوێوە هەڵدەواسێت و، دەرگا نهێنییەکانی ئافاق و ئەنفوس دەکاتەوە. چەند لە سایەی ئیمان و مەعریفەتدا بگات بە ئەودیو پەردەی بوونەوەران، ئەوەندە زیاتر باڵەکانی دەکرێنەوە.. لە دوورتر و پاشان لە دوورتر دەنیشێتەوە.. تا ڕۆژێك دێت "خاك" بەو شتانەی لە سینەیدا شاردوویەتیەوە بانگی دەکات، گەوهەری قووڵایی دەریاکان بە عەسا ئەفسووناوییەکەی ئەو دێنە دەر.. ئاسمانەکان دەرگاکانیان دەخەنە سەر پشت و پێی دەڵێن ''فەرمووا''.

* * *

دایکان سیمایان بەقەدەر حۆرییەکانی بەهەشت ئاخیرەتی و، نیگاکانیان بە ئەندازەی ئەوانەی فریشتەکان قووڵ و، هەستەکانیش وەك هی ڕۆحانییەکان پاك و بێگەردە.. ئەوان گوڵی زەمینەیەکی وا پیرۆزن کە ئاو و خاك و هەوای لەو دیوەوە بۆ هاتووە و، هێندە خۆشەویست و جوان و ئەفسووناوین کە ئەگەر مرۆڤ بە وردی تەماشایان بکات، سیحرێکیان تێدا بەدی دەکات کە سنوورەکانی جیسمانییەت و دنیا و شتانی ناوی و، تەنانەت خۆیشیان، دەبەزێنێت و جێی دەهێڵێت.

9 649750 000529
Kalbin Solukları-1

نرخی ٣٠٠٠ دینارە

İRFAN